# بێداری و کەرکردن

دكتۆر عەلی شەریعەتی

وەرگێڕانی
زیرەك ئەحمەد ڕەحمان



هەولێر - ٢٠١٤

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **بێداری و کەرکردن**
- نووسینی: دکتۆر عەلی شەریعەتی
- وەرگێڕانی: زیرەك ئەحمەد ڕەحمان
- نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ: ڕێمان عەبدولجەبار
- پێداچوونەوەی: موسعەب ئەدهەم
- نرخ: (١٥٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٤
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: موکریانی(هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٣١) ساڵی (٢٠١٤)ـی پێ دراوە.**



**زنجیرەی کتێب (٨٠٥)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## پێشەکی

دکتۆر شەریعەتی یەکێکە لەو بیرمەندە ئیسلامییانە کەوا ڕچەی تایەفەگەری و مەزهەبیی شکاندووە و ئەو سنوورەی بڕیووە، بەڵام کەی؟ لە سەردەمانێك ئەوەی شەریعەتی دەستی بۆ برد، نەك بەزاندنی هێڵی سوور بوو، بگرە پەڕینەوە بوو بۆ ئەوبەری هێڵەکەش، ئێستا تاکە هۆشیارەکانی کۆمەڵگە هەست بەو ململانێ و مەترسییان دەکەن، کەچی شەریعەتی سەردەمانێکی زۆر دوورتر پەی بەم مەترسییانە بردبوو، کاتێك قسە لەبارەی خەڵەتاندن و فریودانی تاکەکان بە بانگەشە درۆینەکان، بە بانگەشەکردنی تایەفەگەری و بەکارهێنانی دین لە کەرکردنی تاك دەکات، وەك ئەوەیە ئەم ساتەوەختە وا لەناوماندا بێت، شەریعەتی گوتەنی ڕۆشنبیری دیندار، هەردەم قوربانی دەستی بیری تەسکیی پیاوانی دینە بەر لەوەی بکەوێتە بەر نەشتەری ڕۆشنبیرانی بێدین، خودی شەریعەتی بە هۆی مەترسیبوونی بۆ سەر پیاوە کۆنەپەرستە مێشك بەستووانی بار بەسەر دینەوە، هەردەم کەوتبووە بەر شاڵاوی ڕەخنەی کرچ و کاڵ و نامەعریفییەکانی ئەو کاهینانە، تەنانەت تا ئەم سەردەمەش شەریعەتی و یاران و ڕێبوارانی ئەم ڕێگەیە دەربازیان نەبووە لە چزوو و ژەهری نەفامی و گەمژەیی و بیر وشکەلێتوو و ئەقڵی موتربەکراوی بیر چەقبەستووی سەدان ساڵی پێشوو ئەمە لەلایەك، لە لایەکی دیکەوە کەسانێکی لاساییکەر، کە بەوپەڕی هەستنەکردن بە خو و نەریت و بیری کۆمەڵگە، ئەوا هەرچی لە ڕۆژئاوا هەیە بەرەو کۆمەڵگەی پەلکێش دەکەن، بێ ئەوەی هەست بەوە بکەن، کە داخۆ تا چەند زەمینەی کۆمەڵگە لەبارە بۆ ئەم کارەیان، لەم سۆنگەیەوە شەریعەتی هەستی بەرپرسیارانەی بەم مەترسییە کرد و لێی قووڵبۆتەوە..دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە لە دەقە عەرەبییەکەیەوە، هەستمکرد کە ئەم کتێبە ڕێك پێویستییەکی ئەمڕۆی کۆمەڵگەکەمانە، بۆیە دەستم بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە کرد. وەرگێڕاوی (الدار العالمية للطباعة و النشر و التوزيع، بيروت-لبنان) چاپی یەکەم (١٩٨٤) بەبێ نووسینی ناوی هیچ وەرگێڕێکی عەرەبی لەسەر بەرگ و

ناوەوەی کتێبەکە. بەڕێز کاك موسعەب ئەدهەم بەراوردێکی بە دەقە فارسیەکەی کردووە، دەستخۆشی لێ دەکەم..

بەو هیوایەم بتوانم سوودێك بە کۆمەڵگە و خوێنەران ببەخشم و ئەم کتێبەش شیاوی ئەوە بێت شوێنێك لەناو کتێبخانەی کوردیدا بگرێت و ئەم وەرگێڕانەی کردوومانە لە ئاستی خوێندنەوەی خوێنەری کورد بێت و لێی سوودمەند بێت..

وەرگێڕ

زیرەك ئەحمەد ڕەحمان

هەولێر- ٢٠١٤

## پێشەکی چاپە عەرەبییەکەی ئەم کتێبە
## بەناوی بەرزی خودا

سوپاس بۆ خودای پەروەردگاری جیهانان، درووود و سەلام لەسەر محەمەد و ئالی پاکی بێت..

دکتۆر عەلی شەریعەتی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەم وانە وتارەی لە حوسێنییەی ئیرشاد لە تاران پێشکەش کردووە، لەسەر کاسێت تۆمارکراوە، پاشان خراوەتە سەر کاغەز، ئینجا لە دوو تویی کتێبدا کۆکراوەتەوە و ناونراوە (خود اگاهی اسحمار) (النباهە و الاسحتمار) «بێداری و کەرکردن» ئێمەش پێشکەشی خوێنەرانی دەکەین، بەو ئومێدەی سوودی لێ وەرگرن، خودای گەورە چاکترین پشت و پەنایە..

# به ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

# بەشی یەکەم

# دەروازە[1]

ئەم بارودۆخە تایبەتییەی تێیدا دەژین، ئەوەمان بەسەردا دەسەپێنێ کە لە سەرەتاوە دوا وتەمان بڵێین ، کتێب لە دواوەیڕا بخوێنینەوە.. ئا لێرەدا ڕەنگە بابەتەکە بێزارکەر بێت بۆ ئەو کەسانەی ئاشنای ئەو دۆخە بیرییانە نین کە دەیانخەمەڕوو، ڕەنگە پێویستییان بە تێڕامان و وردبوونەوەی پتر بێت.. هەر چۆنێك بێ من لەو دانیشتنەدا کۆمەڵە بیرێك دەخەمەڕوو کە پێویستییان بە چەند دانیشتنێکە، بەڵام لەبەر نەبوونی دەرفەت، ئەوەی لە یەکەم قسەمدا دەیڵێم هی ئەوەیە لە کۆتاییدا بیڵێم، ئەمەش بابەتەکە لێڵتر دەکات، بە تایبەتی چونکە قسەکردن لەبارەی پرسە بیرییەکانە، نەك هەر پرسێکی زانستی بێت..

بەر لە دەستکردن بە ڕوونکردەوە و درێژەدان بە بابەتەکە، دەمەوێ بڵێم: پێویستە چاوکراوە و بێدار بین، خۆمان نەخەڵەتێنین بەوەی لە ڕووی بیرییەوە بە توانای زانستی دەوڵەمەندین، چونکە ئەم توانایە درۆزنانەیە و بانگەشەکارەکەشی درۆزنە، بگرە ئەمە جۆرێکی قۆپیە و فڕوفێڵی تایبەت بە ڕۆشنبیرانی ئەم سەردەمەمانن، چونکە بابای خوێندەوار دوای سەرکەوتنی لە خوێندنی باڵا و دەستهێنانی زانیاریی بەرفراوان و ناسینی پرۆفیسۆران ئاشنابوونی بە کتێبی گرنگ، ئەوا هەست بەوە دەکات، کە تێر زانست بووە و لە دەروونییەوە هەست بە لەخۆڕازیبوون و لەخۆباییبوون دەکات، لە لایەنی بیرییەوەش گومانی وا دەبات؛ گەیشتۆتە ئەوپەڕییەکەی کە مرۆڤی هۆشیار دەیگاتێ، بێگومان خوێندەواران لە هەمووان پتر تووشی ئەم خۆخەڵەتاندنە دەبنەوە..

---

(١) لە دەقە عەرەبیەکە بەشی یەکەم و دووەم ناونیشانیان نەبوو، بەپێی ناوەڕۆکی بەشەکان خۆم ناونیشانم بۆیان داناوە لە دەقە فارسیەکەش هەردووکیان ناونیشانیان (خوداآگاهي و استحمار).... وەرگێڕ

پرۆفیسۆر یان فیزیاناس یاخود فەیلەسووف یان ئەدیب یاخود مێژووناس ڕەنگە بیر نەکاتەوە و لە لایەنی بیرییەوە هیچی نەبێ، ئاستی هەستکردنی لە خەڵکی عەوام نزمتر بێت، تەنانەت نزمتر لەو نەخوێندەوارەی نووسین نازانێ، لەوانەشە بەرزترین پێگەی لە شارەزایی کەسێتی و زانیاریی سەردەم و کۆمەڵگەی هەبێ.

مانەوەی خوێندەوار بە نەفامی و ڕۆشنبیری بێ هەست و پێدانی ناوبانگی بەرچاویش پێیان وەك دکتۆر، ئەندازیار و پرۆفیسۆر، بە ڕاستی حاڵێکی زۆر دژوارە، بە تایبەت گەر لەسەر ئەو حاڵەی خۆیشیان بمێننەوە، دوور لە تێگەیشتن و بێداری و هەستکردن بە بەرپرسیاریی لە ئاست جووڵەی مێژوو، ئەڵبەت جووڵەی مێژوو ئەوانە و کۆمەڵگەی ئەم سەردەمیان لەگەڵ خۆیدا دەبات.

مەترسیی مانەوەی خوێندەوار بە نەفامی و کەڕ و لاڵ و کوێرانە وەك مەترسیی هیچ شتێکی دیکە نییە، چونکە کە مرۆڤ تێر زانست بوو هەست بە برسێتیی بیری ناکات، ئەمە لە کاتێکدایە خوێندەواری ئەم ڕۆژگارە وا دەڕواننە کێشەکانی زانست کە لە کێشە بیرییەکان جیا و سەربەخۆ بن..

## بڕیاردان:

کۆمەڵگەکانی جیهانی سێیەم لە ئاسیا و ئەفریقیا و ئەمەریکای لاتینی، لە ڕووی پیشەسازیەوە دواکەوتوون و لە تەواوی لایەنە هونەری و فەلسەفییەکانەوە نەگەیشتوونەتە ئاستی ئەورووپا و ئەمەریکییەکان، ئەڵبەت ئەم کۆمەڵگە هەژار و دواکەوتووانە توانایەکی زۆریان هەیە، زۆر جار بە ڕووی ڕۆژئاوادا دەوەستنەوە و ناچاری ملکەچی و خۆبەدەستەوەدانی دەکەن، ئەمە لە کاتێکدا ڕۆژئاوا گەیشتۆتە لووتکەی پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژی و فەلسەفی. سەرەڕای ئەوەی ڕۆژئاوا ڕوویکردۆتە کڕینی بلیمەت و بەهرەدارانی جیهانی سێیەم، ئەوا سەنتەری داراییشە، بۆیە لەوێدا ئەم توانایانە وەك کاڵا، کڕین و فرۆشتنیان پێ دەکرێت، لەم شوێنەدا هەن کە پارەی لێیە.

هەبوونی ئەم میراتە زانستییە لە هەگبەی ڕۆژئاوا و دەستگرتنی بەم گەنجینەی گشت لقە زانستییەکان، جا لە داهێنانی خۆی بێت یاخود لە بێگانەی وەرگرتبێت، ئەوا ئەورووپا بە هۆیانەوەیە گەیشتۆتە لووتکەی تەواوکاریی زانستی و فەلسەفی و تەکنۆلۆژی، کەچی تەواوی ئەمانە ئەورووپایان نەپاراستووە لە چۆکدادان لەبەردەم ئەم

کۆمەڵگەیانەی هیچ چەکێکی وایان نییە و تاکەکانیشی پێخواسن، تەنانەت هیچ ئامرازێکی بەرگریی لە ژیانی خۆیان و خانەوادەکانیان نییە..لێرەدا پرسیار ئەوەیە: ئایا لەم سەردەمدا دوو لایەنی ململانێ و جەنگ کێن؟!

کۆمەڵێك توانای زانستی و پیشەسازی لە لایەك و لە بەرەیەك، بەرامبەر کۆمەڵێکی بێ پیشەسازی و زانست لە جەنگدان، سەرەنجامی ئەم جەنگەش دوای چەند مانگ و ساڵ لە بەرژەوەندیی ئەو پێخواس و پێ پەتیانی ئەو دنیایە دەبێ، بێگومان لە بەرژوەندیی ئەوانەی خوێندنەوە و نووسین نازانن، ئەو توانا کۆکراوە زانستی و هونەرییانە دەفەوتێن، کە بە درێژایی مێژووی مرۆڤ داکراون!! دەی ئیتر کێ لەگەڵ کێدا دەجەنگێ؟

زانست لەگەڵ «بیر»دا لە جەنگدایە؛ ئەو پێخواس و برسییەی وای بەسەردا سەپاوە هەر هەژار و نەخۆش بێ، پڕ چەکی بڕوا و ئاقیدەیە، وێڕای نەخوێندەوارییەکەی؛ توانیویەتی بە بێدارییەکەی بەسەر ئەوەدا زاڵ بێ کە تەواوی توانا زانستی و پیشەسازی و فەلسەفییە مرۆییەکانی کۆکردۆتەوە و سامانی دنیای داکردووە، کەواتە جگە لە سامان، توانا، زانست، فەلسەفە و تەکنۆلۆژیا شتێکی دیکەش هەیە، گەر چاوپۆشی لە «بوون»ی بکەین، ئەوا لەبەردەم پێخواسانی ڕۆژگاردا شکست دێنین، گەرچی کۆیلەی مەزلوومن، بەڵام لە ناخەوە ئێمە وا ڕووخاوین تەنانەت بگەینە ترۆپکی تەواوکاری، وەك چۆن ڕۆژئاوای وەرچەرخاوی ئەمڕۆی گەیشتوویەتێ (ئەمە بەو مەرجەی ئێمەش بەمە بگەین، بەڵام نایگەینێ).

لێرەدا ئەو کۆمەڵگەیانەی دەیانەوێ بڕیارێك هەڵبژێرن لەبەردەم دوو ڕێگەدان: ڕێگەی زانست و سەرمایەداری و توانا و پیشەسازی؛ ڕێگەی بیر و ئاقیدە، گومانی تێدا نییە ئەو کۆمەڵگەیەی پێوەستە بە ئامانجێکی بەرزەوە بە ئاقیدە و باوەڕەوە، بەسەر هەموو توانایەکدا سەردەکەوێ، تەنانەت گەر ئەو توانایەش بێ بەسەر «سیستەمی ڕۆژ»دا زاڵە. کۆمەڵگەی ئاوا دوای دە پازدە ساڵێك دەبێتە خاوەن شارستانێتیی خۆی، وەك چۆن پیشەسازیشی دەبێ و لەسەر ئاستی جیهاندا بەرهەمی خۆیشی دەخاتەوە. نموونەی زۆر لە ڕابردوودا هەبوون و لە ئێستاشدا هەن. ئەگەر کۆمەڵگە هیچ نموویەك بە ئامانجی خۆی نەزانێ و بێ بڕوا و هۆشیاریی کەسی و کۆمەڵایەتی بێت و خەمی هیچی نەبێ، جگە لە پیشەسازی و سەرمایەداری یاخود ئەوەی ئەمڕۆکە پێی دەڵێن

پێشکەوتنی زانستی و پیشەسازی (ئەوا سەرکەوتووش بێ لەو ئامانجەی، ئەوا هەرگیز تەواو سەرکەوتوو نابێ) ئەڵبەت هەر بە بەکارهێن -مستهلك- دەمێنێتەوە، با وا بزانن کە بەرهەمهێنیشن، ئەمە ئەو خەڵەتاندنە گەورەیە، کە تەواوی وڵاتانی دواکەوتوو تێی کەوتوون، بەمەش تەواوی سەرچاوەی هێزی، تەنانەت ئەو کۆیلە پیرەژنە بێدەرەتانەی لەدەستدا کە سەیر و سەمەرەی بەرهەمدێنا. ئا بەم شێوەیە گەر ئێمە یارانی ئاقیدە بین، ئەوا هەر ساتێ سەرکەوتووانە قۆناخی بڕوا ببڕین، ئەوساکە دەتوانین گەورەترین شارستانێتی بخەینەوە، بەڵام ئەگەر هەست بە کەمی بیری نەکەین و دۆزی بڕوا و ئاقیدەمان بۆ دیارنەکەوت و ڕێمان ڕۆشن نەبوو، ئەوا هەر سواڵکەری دەرگەی سیحری بەرهەمهێنەران دەبین و پشت بە شارستانێتیان دەبەستین و بەرهەمەکانیان بەکاردێنین.

وەك «فانون». یش وا دەڵێ: کۆمەڵگە پاشکەوتووەکان چارەنووسیان بە یەکتر دەچێ، هەر هەمان پێویستییان هەیە، بەڵام بەرەو ڕووی توانای هاوبەش دەبنەوە لە یەك سەردەمی هاوبەشدا، بۆیە لەسەریان پێویستە نێوان «بیر» و «شارستانێتی» بێ بیر یەکێکیان هەڵبژێری، ئەڵبەت مەبەستمان لە «شارستانێتی» ئەوەیە کە شارستانچییان پیشانمانی دەدەن؛ ئا لێرەوە تەنگژەی ڕۆشنبیریی ئەمڕۆ لە وڵاتانی دواکەوتوو، ئەمسەر و ئەوسەری ڕۆژهەڵات یاخود ئەمەریکای لاتینی، بێ جیاوازی، دێتەئاراوە.

تاقیکردنەوەی تەواوی پەنجا ساڵی ڕابردووش ئەمەی دیارخستووە، ئەو کۆمەڵگەیانەی لە خاڵێکی ئاقیدەییەوە دەستبەکاربوون و لە تۆکمەبوونی هۆشیاری تاك و کۆمەڵایەتی کەوتنە جموجۆڵ، ئەمڕۆ لە ڕیزی ئەو توانایانەن کە دروستکەری شارستانێتیی جیهانن، بەڵام ئەو کۆمەڵگەیانە کوێرانە دوای شارستانێتیی ڕۆژئاوایی کەوتوون، بێ هۆشیارییەکی کۆمەڵایەتی یاخود بێ هەستکردنێکی مرۆیی بە هۆشیاری تاك و بێ ئاقیدە، بگرە هەر بە بانگەشەی ڕابوونێکی درۆزنانە، هەر بە بەکاربەری شارستانێتیی ڕۆژئاوایی و بەکارهێنەری بەردەوام مانەوە، ناچاری سەرشۆڕی و کۆیلەیی ژێر کۆنترۆڵی ڕۆژئاوا بوون، لەسەر ئەمە نموونەی زۆر و زەوەند هەیە!!

## مرۆڤ چەند نزیکە، کەچی دوورە!:

ئـەوەی دەمـەوێ بیڵـێم: دیـن[٢]، ئـەو دینـەی لـە سـەرووی زانسـتەوەیە؛ مـرۆڤ بـە زاتێکـی وا بـاڵا دادەنـێ شـکۆمەندتر لـە سـەرجەم ڕووخسـارە سرووشـتییەکان؛ ئەمـە بیروباوەڕی ئەم دینە و بیروباوەڕی «بوونگەراکان (ئەگزیستانسیالیسییەکان)» و خودی سارترە، سارتەر کە بڕوای بە خودا نەبوو، مرۆڤی بە زاتێکی سەربەخۆ لە سەرجەم بوونەوەرە سرووشتیەکان دادەنێ، لای وی مرۆڤ پەتی گەیاندنی بە ئاسمانەوە پچڕاوە، ئۆباڵی تەواوی کارەکانی خراوەتە ئەستۆی خۆی، هەر خۆی بەدیهێنەری کردەوەکان و چارەنووسییەتی و هەر خۆی پەروەردگاری خۆیەتی، بەسەر سرووشتدا زاڵە و لەژێر کۆنترۆڵییەتی، جیا لە تەواوی مەخلوقانی سرووشت کە ژێردەستەی سرووشتن. لێرەدا دەبینین «بوونگەرایی » و «مرۆڤگەرایی (هیومانیزم)» لە خاڵێکدا یەکتر دەگرنەوە، ڕەسەنایەتیی مرۆڤ دەناسێنن و بەسەر گشت ڕووخسارەکانی سرووشتدا پەسەندتر دەکەن.

ئیسـلام بـەهای مرۆڤـی بەرزکردۆتـەوە، تـا ئەندازەیـەك ڕێـزی لـێ گرتـووە، کـەوا ئۆفیسەکانی مرۆڤگەرایی کەمتەرخەم بووە لەوەی بگاتە ئەو ئاستە بەرزە، سەرەڕای پێداگرتنی لەسەر بەرزکردنەوە و پایەدارکردنی مرۆڤ، ئیسلام مرۆڤی بە هەڵبژاردە و جێنشینی خودا لە نێوان تەواوی بوونەوەران داناوە، کە سەرجەم هێزی سرووشتی خستۆتە

---

(٢) مەبەستم لە دین، ئەو دینە میراتیەی کەلەپووری خو و نەریت نییە، چونکە دینە میراتی و کەلەپووریەکان لێکتردەچن، چونکە هەرچیەك بکرێتە میرات و سوننەت و بێ زانیاری و کوێرانە لەسەری ڕابێن، هەرچۆنێك بێ شتێکی نەویستراوە؛ لەمەشدا هیچ جیاوازی نێوان دین و مەزهەبەکاندا نییە، چونکە لەم نەفامیەدا پلەبەندی نییە. بۆیە ئەم بەدواداچوونە لەبارەی «دین بالاترە لە زانست» دەبێت، بەڵام نە ئەو دینەی وەك تەڵقین پاشینە لە پێشینەی وەرگرتووە، ڕێك وەکو کۆمەڵە خوو و سوننەتێکی تەقلیدیانەی دووبارەبۆوە. ئەڵبەتە نەوەی هۆشیار ئەمە ڕەتدەکاتەوە و گوێی پێ نادات، ئەم ڕەتکردنەوەشی شتێکی ئاساییە. گەر ئەم سوننەت و خاسیەتە میراتیە ناعەقڵیانە پشتگوێش نەخات، ئەوا دەیخاتە خانەی «ئەوەی چوو، چوو». ئەمە شتە گومانی تێدا نییە، هۆشیاری دەیسەپێنێت. نەوەی میراتی ئێرانی لەو سوننەتە ناعەقڵیانە یاخییە کە لێی بۆتە بار، سەرەتا هەر بە تەواوی ڕەتیدەکاتەوە، پاشان دەگاتە قۆناغێکی تەواو بەتاڵبوونەوە؛ بریتییە لە ترس و شڵەژان.. و گەڕان و گومان.. و پێویستبوونی بە دۆزینەوەی ڕێگەیەك کە لە کۆتاییدا دەیبینێتەوە.. ئەوەی ئەمڕۆ ڕوودەدات بریتیە لە دۆزینەوەی دین دوای ڕەتکردنەوەی سوننەتە کەلەپوورییە بەردینەکان، نەك تەنها لەسەر ئاستی ئێران بەڵکو لەسەر ئاستی ڕۆشنبیرانی هەموو جیهان. ئەم دینە فەلسەفە و زانست و پیشەسازی تێدەپەڕێنێ، دینی مەعریفە و ئاگاهاتنەوەیە، نەوەك دینی ئەو سوننەتە کەلەپووریە کۆنەی کەس مێژووەکەی نازانێ، داخۆ بۆ بەر لە دوو هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە؟ یاخود سەردەمی ناسرەدین شا؟! هەرچی هەیە، ئەوا بە هۆی کۆنبوونی پیرۆزبووە.

بەر دەست، فەرمانی بە فریشتەکانیشی داوە لە بەرامبەریدا سوژدە  ببەن، وەك بەندەیەك لە خزمەتیدا بن. لە کاریشدا وەك کاری خودایە، ڕەنگە بشێ کاری مرۆڤ لە جیهانی مادە و لە جیهانی سرووشتدا لە کاری خودا بچێ، مرۆڤ دەتوانێ دروستکەر بێ، یاخود زانا.. بەڕێوەبەر و سەرپشکی ڕەهای بێ کۆت و بەندی دوور لە ملکەچکردن بێ، ئەم سیفەتانەش تایبەتن بە خودا.. بەڵام لە ئیسلامدا بە پلەیەکی نزمتر بە مرۆڤ دراوە، زانای خاوەن ویستە، سەرپشکی دروستکەرە، بگۆڕ و یاخییە، بەکاربەری سەرجەم سیستەمی سرووشتە، بگۆڕی چارەنووسی مێژوویی و کۆمەڵگەکەی، تەنانەت خودی خۆیشی..

## هەموو ڕۆژێک:

ئەم بوونەوەرە خاوەن بەها خودایییە بە دوای ڕۆزیی ڕۆژانەیەتی، ڕۆزیی بکوژ بۆ مرۆڤی زیندوو، ئەمە ئەو کەلێنەیە کە هەموو ڕۆژێك بەرزترین بەهای خودایی، مرۆڤی تێوە دەچێت. ژیانی ڕۆژانە ئەو خولە ڕێکخراوەیە کە خۆی بەسەر هەموو بوونەوەردا سەپاندووە، هەر لە ڤایرۆسەکانەوە تا ئاژەڵان، مرۆڤیش دەکەوێتە خولە گەمژەییەکەیەوە؛ دەخوات و دەخەوێت، ئینجا بەئاگادێتەوە تا هەوڵ بدات و بخوات، ئینجا دەگەڕێتەوە بۆ خواردن تا تەقەلا بدات و پشووبدات، ئینجا کاتی دەسبەتاڵی بەڕێ بکات، هەر چۆنێك تەماشای دەکەیت دەبینی لە خولانەوەیەکی بێزار و وەڕس و ماندووکەردایە، بەرهەمهێنان بۆ بەکارهێنان و بەکارهێنانیش بۆ بەرهەمهێنان، ئەمەیە ڕاڕەوەی مرۆڤی ئەو سەردەمە، ئەڵبەت لە ڕابردووشدا هەر وا بووە، چ ڕۆژهەڵاتی چ ڕۆژئاوایی، ئەم خولانەوە پووچە هەستێکی تایبەت بەسەر مرۆڤدا دێنێت! گرێیە دەروونییەکان و ڕك و کینە و خولیا و ئازاری تایبەتی ئاوا، مرۆڤی هۆشیار پەك دەخات..

ڕەنگە جاروبار یەکێك ببینن سکاڵا و گلەیی بکات بە جۆرێك بێزاربووبێ بۆ دەربڕینی ئازارێك کە زۆر پێکەنیناوی دەربکەوێ! ڕەنگە بە گێلایەتیشی پێ بکەنین!! جا گەر لیستێك ئامادە بکەین لە هەرچیەکی لە ژیانی ڕۆژانەمان دەیخوازین، یاخود ئومێدەوارین بەدەستی بێنین تا چێژی لێ وەربگرین..یاخود چاو لەوانە بکەین کە هەیانە، هەوڵی بەدەستهێنانی بدەین؛ تێبینی ئەوەش  بە هۆشیارییەوە دەکەین، ئینجا ئیدانەی خۆمان دەکەین و قێز و بێزمان لە خۆمان و ژیانمان دەبێتەوە، چونکە کە مرۆڤ

ورده ورده پەی بەم شتانە دەبات، ئیدی هەست بە کێشە و دۆزە دەرەکییەکانی دەرەوەی چوارچێوەی خۆی وماڵەکەی دەکات. جا بە بوونی شتێك لە ماڵەکەی هەست بە خۆشی دەکات، کە هاوشێوەی ئەو شتە لە ماڵی خەڵکی دیکەدا نییە، ئەگەر بارودۆخیش یارمەتیدەری بێت، ئەوا ڕەنگە بتوانێ پارچە کوتاڵێکی گران بەها بکڕێت یاخود خۆی لەپاشبدات لە جۆرێکی دیکە بکڕێ و لە چەندان شوێنی جیادا بیپۆشێت، ئینجا هاتوهاواری بەرزدەبێتەوە، هەی هاوار و داد و بێداد!؟ ئای چێژ و داخوازی و ئاواتەکان چ زۆربوون، تا ئەندازەی قوربانیدان بە هەموو شتێك لە پێناو بەدەستهێنانی پووچترین شت! ئەو مرۆڤەی لووت بەرز و بەفیزە، لووتی بە ئاسماندا چووە، دەبینین لە پێناو کەمترین و هیچترین پلە و پایە دێت قبووڵی جۆرێك لە ملشۆڕی دەکات کە سەگیش بێزی نایەت شتی وا بکات، ئاوا ئاشنای ئامادەیی مرۆڤ بۆ ماستاوچێتی و بێ ئابڕوویی دەبین؛ کە لە پشت زۆرینەی بووندایە.

ڕەنگە مرۆڤێك ببینن خەریکە دڵی بوەستێت لە خۆشیدا.. لە ماڵەوەیدا هەڵبەز و دابەز و سەما دەکات؛ بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئەم بەیانییە لە فەرمانگەدا چاوی بە ئۆتۆمبێلی سەرۆك کەوتووە، لە ساتەوەختی تێڕوانینیدا هەستی بە جۆرێك ڕەزامەندی جەنابی سەرۆك کردووە، نیمچە بزەیەك لەسەر لێوانی سەرۆك دەرکەوتووە، وەك چۆن لەسەر لچ و لێوی خاوەن سەگیش دەردەکەوێ کە سەیری سەگەکەی دەکات، ئا چێژبەخشە!!!، جا ئەگەر لیستێکی ناوی ئەو شتانە ئامادە بکەین کە ناوی چێژی بە سەرەوەیە، ئەو شتانەی هەردەم بە هۆشماندا دێت و هەوڵی بەدەستهێنانیان دەدەین؛ جا هەرچی بێ؛ جلوبەرگ، ئۆتۆمبێل، خانوو، بڕوانامە و پێگەی بەرز، ئەوا دەبینین هەرچی بە نرخە و گرانە بۆیان دەکەینە قوربانی! قوربانی دەدەین بە کات و مرۆڤ و زیرەکی و بێداری و توانا و شانازیی خودایی.. بە شیانی یاخیبوون.. بە توانای هەڵبژاردنی ئازادانە، بە ئامادەیی هێزی ڕەتکردنەوە، بە توانای بونیادنان، بە هێزی گۆڕانکاریی، بە هێزی گۆڕینی چارەنووس، بە هێزی ڕەتکردنەوەی هەرچی بەسەرماندا سەپاوە و گۆڕینی بەوەی دەمانەوێ...قوربانی بە هەموو ئەمانە دەدەین و بێ ئەوەی هەندێ کاتمان هەبێ تا تێیدا بیربکەینەوە ڕابمێنین. ئیتر بەم شێوەیە مرۆڤ لە ژیانی ڕۆژانەیدا دەبینین هەردەم ڕووە و دەرەوەیەتی، ڕووی لەوێیە کە چێژەکانی تێر دەکات، ئارەزووی بەرەو حەزەکانییەتی..دەبینین ئەو «من»ەی لە دەسەڵاتی خوداوە

دابەزیەوە، دادەبەزێتە ئەوپەڕی نزمیی هەتا وەکو کرم نووقمی ناو زەلکاو و چڵکاوی بۆگەن دەبێت. ئینجا «من»ـەی خاوەن بوونی بەردەوام وا پارچە پارچە دەبێ، کە هەر پارچەیەکی دەبێتە نێچیری ئارەزوویەکی نەگریس و هەوەسێکی بۆش و ئومێدێکی پڕوپووچ!! ئیتر ئەمەیە قوربانیدان بە بەرز و بەڕێزترینی شتەکان لە پێناو دەستکەوتنی هیچ و پوچ و قێزەونترینی شتەکان!

## لەرزەک:

نامەوێ ئەخلاقیانە ئامۆژگاری بدەم؛ چونکە مرۆڤ خۆی ڕووە و نەمان هەنگاو دەنێ، بەڵام بەهای مرۆیی بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار لەناوچوون واوەتر دەکات، مەزنترین بەهای مرۆڤ، ئەو بەهایەیە کە لێوەی دەستی پێکرد، ئەویش ڕەتکردنەوە و «ملکەچ نەبوون» کە لە وشەی «نا» پوخت دەبێتەوە، کە ئادەم باوکی مرۆڤ پێی دەستیپێکرد، فەرمانی پێکرا کە لەو درەختە نەخوات، بەڵام خواردی، ئیتر لەمەوە بووە ئەو ئادەمە و باوکی مرۆڤ و دابەزیە سەر زەوی، گەر ئەمەی نەکردایە دەبووە فریشتەیەك و کەسێکی تر دەبووە ئەو ئادەمە مرۆییە. یەکەم شتی ئادەم لە ژیانی ڕۆژانەی تێکیدا یاخیبوونی بوو، ئەو یاخیبوونی وای لێ دەکات هاوتای پەروەدگارەکەی بێ لە گەردووندا؛ بۆچی؟ ڕەنگە لە پێناو قەرزێك واژۆی بەڵێننامەی چەکی دوو سێ چوار ساڵە بکات، پاشانیش ناتوانێ نکۆڵی بکات، ناشتوانێ هیچ بڵێت لە کاتی داواکردنەوەی قەرزەکە، جگە لە ملکەچی و گوێڕایەڵی، لەبەرئەوەی قەرزەکە دابەشی سەر چەکەکان کراوە، بە گوێرەی مووچە و توانای دارایی. ئا لێرەدا دەبینین ئەو سیفەتە خودابەخشییەی دەڕوات دەبێتە قوربانی بەفرگر (سەلاجە) و خانوو و ئۆتۆمبێل، ئەو مرۆڤەش نازانێ کە چی دۆڕاندووە، بەرامبەر ئەوەشی دۆڕاندوویەتی داخۆ چی بردۆتەوە، نازانێ چێژ لە چی وەربگرێت، چەندە چێژ لە هەبوونی ئۆتۆمبێلێك وەردەگرێ، کە لە پێناویدا ناملکەچی و شیانە خودابەخشییەکەی و بوونی وەك جێنشینی خودا لەسەر زەوی بەخشییەوە، مەگەر ئەو چێژە بەرامبەری چێژی یاخیبوونییەتی؟ بێگومان ئەوەی هەست بە چێژی یاخیبوون و ڕەتکردنەوە و بێداری بکات، ئەوە بە هیچیان ناگۆڕێتەوە، بە هیچ نرخێکی زۆر و زەوەند نایانفرۆشێ، بەڵام داخۆ چ ڕوویداوە تا ئاوا بە ئاسانی ئەو ئاڵوگۆرە بکەین؟! دیارە کە بێدار نین و

نایەینەوە هۆش خۆمان، مەگەر دوای ئەوەی دەستێکی بەهێز بەسەرماندا زاڵ دەبێ یاخود بە قامچییەکی بێبەزەییانە بەسەرمانەوە دەبێتە کەڵەگا، ئەو دەستە لە خافڵبوون و سەرقاڵیی کارگێڕی و خێزانیی و خەوی قووڵ هەڵمان دەستێنێت، تاکو هەست بەوە بکەین، چ کاتێکمان لێ ڕۆیشتووە و چ تەمەنێکمان لەدەستداوە و چەندی ماوە؟ چەند هەلمان لەکیسچووە، چەند ناز و بەخشش و بەهامان لەدەستچوو بە هۆی سەرقاڵیمان بە شتی دیکەوە. دوای ئەوەی ئەوە دەستەی لەنێوان ئەو هەموو چەپەڵییەدا دەرمان دێنێت، لەبەر خۆرەتاودا وشکمان دەکاتەوە، ئینجا بۆ بەئاگاهێنانەوەمان لێمان دەدات و بانگمان دەکات: ئەی مرۆڤ هێی تۆ! لەگەڵ تۆمە ئەی مرۆڤ!!

## پووچی و بێهودەیی (العبث):

با نموونەیەك بێنینەوە؛ ئا ئەوە «ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم»، پیاوێکی بێ چاکە و بێ خێر و بێر، خودان سامانێکی زۆر، بەڵام بێ جووڵە و کار، تەنها خەریکی ڕاوکردن بوو. خەڵکی ڕەنجدەربوون ئەویش ڕەنجخۆر. ئیتر ئیشی چ بکات؟ هەر دەچووە ڕاووشکار، ئیدی خوی پێوە گرت تا ئاڵوودەی بوو، ئیتر تاکە بایەخی هەر ئەمە بوو، دەگەشایەوە کە دڕندەیەکی ڕاودەکرد، دڵخۆش دەبوو و قاقای پێکەنینی بوو. ڕەنگە هیچ پێویستی بە گۆشت و پێستەی ئەو نێچیرەش نەبوو بێت، تەنیا چێژی لە ڕاوکردنی دەدیت..ئای کە دەردێکی قێزەونە مرۆڤ ئەو هەموو گەورەییەی بخاتە بەر کارێکی وا تا ویستێکی تێر بکات و ئارەزوویێکی بەجێ بێنیت، ئیدی ئەمە فەلسەفەی ژیانی «ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم» بوو، ئەفسووناوی، بەڵام ڕاستتر لە واقیع..

ڕۆژێکیان «ئیبراهیم» لە ڕاووشکاری خۆی بوو، نێچیرەکەی لە شوێنی خۆی وەستا و نەجووڵا، وەك ئەوەی کەسێك بێ بە ڕوویدا بوەستێتەوە، ئیتر وای هەستکرد دەنگێك وەك هەورە تریشقە گوێی کاس بکات: «ئەی ئیبراهیم، ئەرێ خودا تۆی بۆ ئەمە خولقاندووە؟» ئیبراهیم لە شوێن خۆی وەستا و بێداربۆوە، ئێمە هۆشمان لەو کاروبارانە نییە کە بە درۆ دەیخەینە پاڵ خۆمان، لە هەمان کاتیشدا لە هەموو کەس بێبەشترین، ئیبراهیم وەستا وەك ئەوەی یەکەم جاری بێ، کەسێك بناسێت، چاوی گێڕا بەو بوونەوەرە مەزنە، ئا بەم شێوەیە «ئیبرهیمی کوڕی ئەدهەم» وەستا و گەڕایەوە،

گەڕانەوەیەکی وا لە بەردەم بەرزیی پایە و بڵندیی پێگەی ئیبراهیم هەر تاکێك خۆی بە بچووك و بێ نرخ دادەنا..

## ئاسوودە بە زەبوونی:

ئاوها بوو! میرێك لە قەفەسێکدا دەژیا، کە لە زێڕ بۆی دروستکرابوو، هەموو شتێکی دەوروبەری بۆی ئامادەکراوە، ئامانجەکانی بەدیهاتوون، تەنانەت ڕاووشکار بۆی سازێنراوە تا هەر کاتێك ویستی بۆی ئامادەبێ، لە شوێنێکی دیکەیشدا چەند مەلەوانگەیەك و لە دەوری هەر مەلەوانگەیەکیش داری نیلۆفەری ڕەنگ تایبەت.. باخچە، هۆڵ، بەزمگە (ملهى)، سەماکەر.. تا ڕۆژێك لەم قەفەسەیدا چووە دەرێ، مردووێکی بینی و پرسی:

- ئەمە چییە؟.

+ ئەمە سەرەنجامی مرۆڤە.!

- سەرەنجامی منیش؟.!

+ بەڵێ.!

- مردن چییە؟.

+ مردن دۆخێکە چارەنووسی هەموو زیندووێکە لە کۆتایی ژیانی.!

- ئەدی پاشان چی؟ و چۆن دەبێ؟.

+ هەموو کەسێك دەبێتە لاشەیەك، جا هەر چۆنێك بێ و لە هەر کوێ بێت.!

لەم قسانەدا بوو نەخۆشێکی بینی، گوتی:

- ئەوە کێیە؟.

+ نەخۆشە.!!

- نەخۆشی چییە؟.

+ نەخۆشی پێشهاتێکە مرۆڤ بەر لە مردنی تووشی دەبێ جا گەورە بێ یاخود بچووك، بەهێز بێ یان لاواز.!

- تووشی منیش دێت؟.

+ بەڵێ! نەخۆشی، گوێ بە هیچ بەربەستێك نادات و دیوارەکان و پەردەکان دەبڕێ!

سبە و دوو سبەی ڕەنگە بڵێ:

- ئەوە کێیە؟ ئەو پشت چەماوە؟.

+ ئەوە پیرەمێردێکە.!

- پیرەمێرد! پیری چییە؟.

+ ئەوە سەرەنجامێکی حەتمیی هەموو مرۆڤێکە.!

- تەنانەت منیش؟.

+ بەڵێ، تەنانەت تۆش!!.

ئینجا ڕەنگە بپرسێ:

- ئەوە کێیە؟.

+ ئەوە سواڵکەرێکی هەژارە.!.

- سواڵکەری هەژار چییە؟ .

+ مرۆڤێکە خاوەنی پێویستییە، هیچی نییە، جگە لە قاپێکی سواڵکردن، تاوەکو گەندەخۆرانە لێرە و لەوێ سکی تێر بکات.

ئەم چوار خورپەیە (صدمة) ئەو پیاوەیان بێدارکردەوە کە بێ ئاگا لە خۆشی و شادمانی نێو باخەکانیدا دەیگوزەراند؛ لە هێمنی و خۆشگوزەرانیدا دەژیا، لە هەموو ڕووێکەوە لە گەمژەییەکی تەواودا بوو. ئەم چوار خورپەیە هیچ میر و «بودا»ییەك نەناسێ، کە بەئاگایان دێنێتەوە. لەناکاو هەست بەوە دەکات، لەناو چ گەنیوێکدایە یاخود لە ناوەڕاستی چێژگەلێکی پووچی بەتاڵدا دەژێت، تەنانەت لەناو ژاوە ژاوەی ئەو چێژانەدا سامانێکی بێژمار پشتگوێ دەخات، کاتێکیش یاخی دەبێ تاکە شتێك بتوانێ بیکات، ڕاکردنە لە هەموو ئەمانە، بێ ئەوەی پەنجەی پەشیمانی بۆ گەڕانەوە بۆیان بگەزێ یاخود بیرکردنەوە لە تینوو بوون و پێویستبوون بۆ ژیان لە کۆشکێکی نارس کەیفساز بژییێت![٣]، وەك چڵەپۆپەی دار حەیزران دەرچووە لەوەی بچەمێنرێتەوە، تۆش کە دیلی ماڵ و سامان و کامەرانی خۆتی، وەك دارێکی پڕ بەروبووم وای، لقەکانت وەها شۆڕی سەر زەوی بوونەتەوە خەریکە دەشکێنەوە، بەڵام چڵەپۆپەی درەختی سەروو ڕوو لە خۆرە و بەرگەی قورسایی ناگرێت!! تۆش خۆتیت!! ئەی ئەو کەسەی گەورەیی خودات تێدا دەرکەوتووە، تۆ ئەی ئەوە کەسەی تایبەتمەندیی «نا»یە، ئەوە تۆی! وەك

(٣) هەژمارکردنی دەقەکانی خودی بودایە.

نیلۆفەر لەژێر تیشکی خۆردا تیشك و ڕووناکی دەخەیتە ناخی نەناسراوێك، بوونی خۆت بەرز بنرخێنە، پشتت لە هەموو ڕواڵەتبازی و ئەم ئارەزووانە بکە کە ژیانی ڕۆژانەمانی پچڕپچڕ کردووە، بووینەتە قوربانی هەوەس و ڕك و خۆزگەکانمان، خۆت بگرە لەو شتە هیچ و پووچانەی مرۆڤ ناحەز دەکات، کە مرۆڤیان کردۆتەوە بووکەڵەیەك خەسڵەتی ئاژەڵانی وەك مشك و گورگ و بەرازی تێدا بەرجەستە بووە. شکۆ و گیانی خوداوەندی و جێنشینبوونی خودا لەسەر زەمینی بیرچۆتەوە، ئەو توانا و بەهایەی خۆی بیرچۆتەوە کە نەدراوە بە جگە لەو، خەریکە خۆی بەکار دەبات و خۆی ملکەچ دەکات و دەیکاتە کۆیلەی کەس و شتانی دی، بە ئاسانی کوچکوچە دەکات، بێ ئەوەی هەست بکات کە قوربانی بە تەواوی مرۆڤبوونی خۆی دەدات، بە هۆی پێداهەڵدانی کەسان و شتانی دیکە، هەموو ئەمانە لە پێناو گەیشتن بە ئامانجێك لە ئامانجەکانی، بەڵام ئەوەی سەرشۆڕە و کوچکوچە دەکات، ئیتر مرۆڤبوونی نامێنێ!! چونکە هێشتا هەستی بەوە نەکردووە، کە لە کۆیلەیی و ملکەچکردنیدا شتێکی وای دۆڕاندووە هێشتا نرخەکەی نازانێت!!

## پەند و ئامۆژگاری:

مامۆستایەك ئامۆژگاریی پڕ لە باسی ئاکار خراپی دەکردم، بەڵام ئامۆژگاریی تۆکمەی دەکردم. لە ئامۆژگارییەکانی دەیگوت: مرۆڤ نابێ لەسەر کەسانی دیکە توند بێت، بگرە دەبێ زیرەك بێت و سوود و قازانجی بپارێزێت، هەموو هەلێك بقۆزێتەوە. ئینجا دەیگوت: کەسێکی دیکە هەبوو ئامۆژگاری دەکرن، و دەیگوت: ئەم ڕیشە (ڕیش لە نیشانەکانی شەرەف و جوامێری پیاوە) هیچ بایەخی وای نییە، هەندێ جار بارودۆخ و سوودی وا دەڕەخسێنێ، مەگەر مرۆڤ بیخاتە ژێر چەناگەی کەرەوە .!

بەڵێ.. لەپێناو سوود و قازانجدا نمایشی ڕیشی دەکات و بە «شامپۆ» و سابوون دەیشوات و بۆن خۆشی دەکات، ڕیشێکی جوان و بێ هیچ چڵك و تۆز! بێ هیچ کەموکوڕی؛ بگرە ڕەنگە ئەرکی خۆی تەواو جێبەجێکرد بێت! ئیتر ئەمەیە فەلسەفەی ژیانمان، کە زۆر قێزەونانە دەردەکەوێ، بەڵام وا دیارە کردەوەکانمان زۆر قێزەونترن!!

# بەشی دووەم
# بێداری

(بێداریی تاك) ئەو شتەیە كە بۆ خودی خۆم پاڵم پێوە دەنێت و لە سەرقاڵبوون دەرم دێنێت، زۆرجاریش دەمكاتە قوربانی خۆی. بێداریی تاك یاخود (بێداریی خودی) هەموو كات هانم دەدات، كە خۆم وا ببینم هیچ كەس نیم و وێنەی ڕاستەقینەی خۆم بە چاوان ببینم؛ لە كاتێكدا ئەوانەی ڕۆژانە سێ چوار كاتژمێر بەرامبەر ئاوێنە دەوەستن، هەرگیز ڕێك نەكەوتووە خۆیان وا ببینن! كەواتە ئاشنابوونی خودی یاخود ناسینی تاك یان ئەو بێدارییەی لای تاك هەیە، بە بەراورد بە خودی تاكەكە لە سەرووی زانینی فەلسەفە و زانست و پیشەوەرییە. ڕاستە ئەمانە مەعریفەیەكن، بەڵام مەعریفەی خودناسین نین، واتە شتێك نییە كە خودی خۆم بە ڕووە ڕاستەقینەكەیم پیشان بدات، بگرە دەرم بێنێت تاوەكو خودی خۆم بناسم، بە كورتییەكەی شتێك نییە سەرنجم بۆ سەنگ و بەهای خۆم ڕابكێشێت. بە ڕاستی بەهای هەر یەكێك لە ئێمە بە ئەندازەی بڕوابوونییەتی بە خۆی، گەر بڕوانینە سیستەمی پەروەردەیی و كۆمەڵایەتیمان، ئەوا بە ئاشكرا كارەساتەكانمان دەبینین، داخۆ لەم بوارەدا چەند قێزەونكراوین؟! تا چ سنوورێك زەبوونكراوین، بە ئەندازەیەك بڕوامان بە بەهای تواناكانمان نەماوە، وامان لێهاتووە خۆمان وا بە پەككەوتەیی دەبینین، كە بێچووی ئاژەڵانیش بەم لاوازییە ناڕازییە!! پەكمان لە ڕەخنەگرتن و بەدواداچوون كەوتووە، بگرە لە ئاخاوتنیش! وامان لێهاتووە بوێری ئەوەشمان نییە گومانی ئەوە ببەین كە دەتوانین بچووكترین كار ئەنجام بدەین! بەڵێ گەیشتووینەتە ئەم ئاستەی لاوازی و متمانە بە خۆ نەبوون!!، بێگومان ئەو نەوەیەی خۆی قێز و بێز لە خۆی دەكات، ئیدی هەر قێزەون دەبێت، وەك سیاسەتێكی كۆیلاندن، تا وا گومان دەبات كە لە خێزانێكی دابەزیو و چینێكی نزمدایە، ئیتر لەسەری سووك و سانایە بە سنگێكی فراوانەوە قبووڵی زەبوونی بكات، بە ملكەچییەوە پەنا دەباتە بەر ئامێزی كۆیلایەتی.

## بچووک و بچووکتر:

.. ڕۆژئاوا چی لە ئێمەی موسڵمان و ئێمەی ڕۆژهەڵاتی کردووە؟ بە سووکی دەڕوانێتە دینمان، ئەدەبمان، بیرمان، ڕابردوومان، مێژوو و ڕەسەنایەتیمان، هەموو شتێکمان بە بچووك دەزانێ، تا ئەندازەیەك کە ئێمەش لەگەڵیان گاڵتە بە خۆمان دەکەین!! بەڵام ڕۆژئاواییەکان خۆیان پەسەندتر و بەرز و باڵاتر ڕادەگرن، ئێمەش لاسایی ئەوان دەکەینەوە لە جلوبەرگ، ڕەفتار، جووڵە، ئاخاوتن و بۆنەکان، وامان لێهاتووە کەوا ڕۆشنبیرانی ئێمە شانازیی بە لەبیرچوونەوەی زمانی ڕەسەنیان بکەن!! ئەمە چ گاڵتەجاڕیەکە؟ مرۆڤ ئاوا شانازیی بە لەدەستدانی هەست و هۆشی بکات!؟ زۆر سەیر و سەمەرەیە.! مەگەر ئەوە کەم نییە کەسێکمان شانازیی بە فێربوونی زمانی فەرەنسی بکات تاوەکو شانازیی بەوەش بکات کە زمانی ڕەسەنی خۆی بیرچۆتەوە!؟ لەم دۆخەدا چەندە بەو منداڵە دەچێ کە دایکی لێی تووڕە دەبێ و لێی دەدا کەچی هەر دەچێتەوە لای تا خۆی لە تووڕەبوونی وی بپارێزێت! ئیتر ئەو ڕەگەزەی خۆی باڵادەبینێ و ئەو گەلەی شانازیی بە شارستانیبوونی دەکات و پەنا دەباتە بەر سووك ڕوانینی گەلانی دیکە، ئەڵبەت لە پێناو دەستگرتن بەسەریان و داگیرکردنیان.. ئیدی ئاوایە بێگانە بە سووك دەڕوانێتە دین، بڕوا، ئەدەب و بیر و کەڵە پیاوان و ڕابردوو و هەموو شتێکی ڕۆژهەڵاتی، ئەمەش تاوەکو ڕیسواکراو لە تەواوی ئەمانە ڕابکات کە گوایە بوونەتە هۆکاری ڕیسوابوونی و سووك و ترۆکردنی، پەنا بباتە بەر ئەو سەرچاوەی قێزەونی کردووە و بە کەم و سووکی زانیووە، ئیتر خۆی وەکو سەرزەنشتکاران دەردەخات بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێ لە چوارچێوەی تۆمەتباری و سووکبوون.

لێرەوە هەندێ نموونەی وا دەبینین! لە ١٥%ی ئەورووپاییەکان حەز بە ئاوازی کلاسیکی دەکەن، بەڵام تەواوی ئێرانییەکان ئاهەنگ بە تەواوی جۆرەکانی ئاواز دەگێڕن! داخۆ کامیان نایەوێ هەستی ببزوێت و پێچەوانەی ئەو سرووشتەیە کە چاکترینە یاخود ئەو حەز و ئارەزووەیە کە پەسندترینە؟؟ بابای فەرەنسی ڕەنگە بە ئاسانی ڕای خۆی دەرببڕێت و بڵێ: دەنگی ئەو ڕادیۆیە بگرە، لەبەر هەر هۆیەك بێ؟! بۆ؟ وا دیارە نموونەی باڵایە!!

بڕوابوون بە خود تاکە شتێك بۆ مرۆڤ دابین دەکات ئەویش «هۆشیاریی تاك»ـە، ئەمیش بە پلە یەك بریتییە لە ناسینی نەژاد و ڕەچەڵەك و پێوەستبوون بە کام ئۆمەت، کام مێژوو، کام شارستانی، کام ماوەی کاتی، کام ئەدەب، کامە شکۆ و بەها!! ئەمەیە گەڕانەوە بۆ «هۆشیاریی دەروونی»، وێڕای ئەمەش گەڕانەوەیە بۆ «هۆشیاریی بوون»، کە وام لێ دەکات هەست بە خۆم بکەم وەك بوونەوەرێکی مرۆیی لەوپەڕی ڕێزی خودایی. ئیتر ئاوا خۆم بەو ڕووخسارانە دەبینم و تەواو ئاشنا و هۆگریان دەبم، ئیتر هەرگیز و بە هیچ نرخێك دەستبەرداری نابم، هەرگیز ناکرێ سازش لەسەر چرکەیەك لە بوونم بکەم، بە تایبەتی کە زانیم «من» کێم! ئا ئەوە «من»ـم! گەورە بە گەورەیی تەواوی بوونەوەر..ئەو ساتەی خۆی دۆزیەوە و گەیشتە «هۆشیاریی خود».

## کۆمەڵگەی بێداری:

پرسی دووەم کە ناوم ناوە «ڕۆشنبیری» بریتییە لە هۆشیاریی سیاسی بە واتا ئەفلاتۆنییەکەی، نەك بەواتا ڕاگەیاندنە ڕۆژانەییەکەی، بگرە بە واتا "ئەفلاتۆن"یەکەی بۆ گەڕان بە دوای دەستنیشانکردنی بژاردەکان. واتە هەستکردن و پێوەندیی تاك بە قۆناخی چارەنووسی مێژوویی و کۆمەلایەتیی کۆمەڵگە، هەروەها پێوەندیی بە ڕۆڵەکانی گەل و ئۆمەتەکەی و هەستکردن بە پێوەندی و پێوەستیی بە کۆمەڵگەوە، هەروەها هەستکردنی بە بەرپرسیارێتی وەك پێشەنگێك و سەرکردەیەك لە پێشی پێشەوە، لە پێناو ڕاستەڕێبوون و سەرکردایەتی و ئازادی. تەواوی ئەمانە وەك بەرپرسیارێتیی دووەمیی مرۆڤن، ئەڵبەت ڕۆشنبیریی مرۆڤ لە چەسپاوی و پتەوبوونییەتی دژ بە ملکەچکردنی.

## پێچ و پەناکردن(مراوغة):

بێداری دوو جۆری هەیە: «بێداریی خود یان تاك» و «بێداریی کۆمەڵایەتی»، وا دێینە سەر باسکردنیان. دوژمنی من وەك مرۆڤ و دوژمنی ئێمە وەك کۆمەڵگەی مرۆیی یاخود ئیتقاتی، ئەو کەسەیە کە ئەو دوو هۆشیارییەمان دەبات، بەرامبەریشدا هیچ قەرەبووێکمان ناکاتەوە، جگە لە نەفامی هەژاری و زەبوونی..گەر بە مەعریفەکیش قەرەبوومان بکاتەوە، خۆ ئەوە دوژمنە هەر مەعریفەیەکی فەلسەفی یا هونەری یا

زانستیمان بداتێ، ئەوا لە بەرامبەردا بێداریی خودی و کۆمەڵایەتیی ئێمە تاڵان دەکات، ئەو بێدارییەمان دەبات کە تایبەتمەندیی پێغەمبەرانە یاخود لەناومانی لاواز دەکات[٤]، خۆ جیاوازیشی نییە بیبات یاخود لەناوی ببات، بەڵام گەر ئەمەمان زانی ئەوا تەواوی کێشەکان لەلامان ڕوون دەبنەوە، دەتوانین هەڵسەنگاندن و خەملاندن و پێوانەی تەواوی کاروباری چواردەورمان بکەین..

ئێستا دوژمن وەك جاران نەماوە، بە چەك و جبەخانەی وەك شمشێر، قەڵغان، زرێ و خودەوە نایەت بکوژێ و ببڕێت، ئینجا بە پەلە لەکوێوە هاتووە بگەڕێتەوە ئەوێ، تا زووتر بزانیت ئەوە دوژمنە..نەخێر وا نییە، کە وای تێگەیشتوون، بگرە بە جل و پۆشاکی خۆمانەوە دەردەکەوێ، نەك وەکو پێشوو بە قامچییەوە بێ، خەڵکان بە گاڕان بباتە سەر سندووقەکانی دەنگدان بۆ ڕاپرسی!! ئەو قامچییە نەما، بەڵکو چۆتە ناو مێشکی کرێکارەوە و بەرەو سندووقەکانی دەنگدانی دەبات.. سەرپشکە و دەتوانێ بە ئازادانە دەنگ بدات، هەرچەند داهاتووش دیار و ڕوون نییە، داخۆ لە «گۆڵد وۆتەر» یاخود «جۆنسن» کامیان هەڵدەبژێرێت، بەڵێ لە هەڵبژاردن ئازادە، بەڵام ئەم جگە لەم دووانە کەسی دیکەی ناوێ؟! بەم پێیە هەر کامیان هەڵبژێرێت ئیتر ئەنجامەکە بۆی هەر یەکە!!..

## گەمەی کاتدانانەوە (التوقیت):

وەك چۆن ئەمڕۆ هیربار (قاپ، مەنجەڵ، کەوچ و...هتد) لەو مادە لێککشاوە دروست دەکرێت، ئەڵبەت دوای ئەوەی کە مادە خاوەکە دەخرێتە کورەی گەرمەوە، پاشان دەخرێتە ناو قاڵبی ئامادەکراو لەسەر شێوەی هیربار، تاوەکو دۆلکە و پەرداخ و جام و ئەو پێداویستییانەی دیکەی لێوە بەرهەم بێن کە دەخرێنە بازاڕەوە؛ بە هەمان شێوە مرۆڤیش دروست دەکەن!! نەوە دروست دەکەن؟! دانیشتنێکی هاوبەش سازدەکرێت لەنێوان زانای

(٤) پێغەمبەران فەیلەسووف نەبوون، نە هونەرمەند بوون، نە ئەدیب، نە شاعیر نە زانای جوانیناسی؛ بەڵکو لە عەوامی ئۆمەت بوون، بەڵام بێداربوون و هۆشیاربوون بە ڕۆژگاریان، بۆیە بوونە پێشڕەوی مێژوو و بزواتەکەیان، ئیتر شارستانێتیان بنیادنا، ڕێڕەوی کۆمەڵگەیان وا گۆڕی بە تواناتر لە هەر دانایەك.. و هۆشیارتر لە هەر بیرمەندێك و زانایەك و نووسەر و ئەدیبێك.. ئەم مەعریفەی پێغەمبەرێتیە تەنانەت دەشێ بۆ تاکێکی ئۆمی بێت.. دەشکرێ مرۆڤ زانای کردەوە و نەقڵکردنیش بێت، خاوەنی زانستی کۆن و نوێ بێت، بەڵام لەم مەعریفە کۆمەڵایەتیە پێغەمبەرانەیە دووربێت.

کۆمەڵناسی و مێژووناس و ئابووریناس و پسپۆڕی پەروەردە و فێرکردن و..هتد، ئەوانە پێکەوە دادەنیشن لەنێوان خۆیاندا گفتوگۆ دەکەن، پاڵپشتی دارایی دەکرێن، هێزیش لە پشتیانەوەیە، ئیتر لێیان داوادەکرێت:

- ئادەی پلاندانێن.!

+ سەر سەر و سەر چاو، بەڵام چ جۆرە مرۆڤێکتان دەوێ؟ بفەرموون تاکو کاری خۆمان بکەین.!

- لەم کۆمەڵگە ئەفریقی یاخود ئاسیایی یان ئەمەریکایی لاتینی نەوەیەکی نوێمان دەوێ، گێل نەبێ سەری لە خەنە بگرێت، بەڵام خەنەمان نییە، بەڵکو جوانکاریی دیکەمان هەیە، دەمانەوێ لەوێدا بەشی بکەین و هیچیشی لێ نامێنێتەوە، بەڵێ! نەوەیەکی جوان و ئێسک سووکمان دەوێ، دابڕاو لە هەموو هەستێك بە پێی پێوەرە باڵاکان! بەڵێ ئا ئەوەمان دەوێ نە زیاتر نە کەمتر.!

+ سەر سەر و سەر چاو! دوای چوار ساڵ ئامادەیە و دەیخەینە بەر دەستتان .!

لەپڕ و لە میانەی دە ساڵان لە ساڵی (١٩٤٥تا ١٩٥٥)، دەبینی ڕێژەی کەلوپەل و پێداویستییەکانی جوانکاریی ئەورووپایی لە تاران گەیشتە پەنجا ئەوەندەی پێشوو.

+ باشە چۆن ئەم نەوەیە دروست بکەین؟.

- پێویستمان بە نەوەیەکە شێوازی کۆنی ژیان ڕەت بکاتەوە و نکۆڵی لێ بکات، هەندێ بیری نوێی هەبێ، بەڵام زۆریش نا!!، چونکە گەر زەڕەیەك نوێبوونەوەی بیری زیاد بکات، ئەوە زیانبەخش دەبێت!! وا پێویستە کە سرووشتێکی نەرمی هەبێ، ئیدی شیر نەخواتەوە..بەڵکو کۆکا کۆلا بخواتەوە.!!

هەر تەنیا تا ئەم ئەندازەیە، بەڵام گەر لەم سنوورە تێپەڕێت ئەوا مەترسی و کێشەمان بۆ دەنێتەوە و تێچووی زۆرمان دەخاتە ئەستۆ! بەڵێ هێندە بەسە! ئەوەندە بەسە تا ئەو سنوورە نوێ ببێتەوە لەگەڵیدا نەرم بیت، پۆشاکە کۆنەکانی داکەنێت و بیخاتە تەنەکەی بیرچوونەوە، بەڵام هەستکردنی تێنەپەڕێتە ئەو سنوورەی کە خۆی بناسێت و جۆر یاخود ڕەنگی پۆشاکەکانی دابهێنێت یان هەڵی بژێرێت. وەك ئەوەی بڵێین: ئەمە بە تۆ پێوەست نییە، تۆ مرۆڤ نیت تاوەکو ئەمە هەڵبژێریت! گوتمان: هەر تەنها جلەکانت داکەنە، نەوەك زیاتر.! بەڵێ نوێبوونەوە تا ئەندازەیەك گەر پێی بڵێین «ئەو» بڵێت «ئەو».. گەر

گوتیشمان «ها» ئەویش دووبارەی بکاتەوە «ها» «ها»!!! لەسەری پێویستە لە خۆیەوەیە وشە نەدرکێنێت..ئیتر ئێمە ئاوامان دەوێت!!.

+ سەر سەر و سەر چاو، ئەوەی دەتانەوێ بۆتان دروست دەکەین، بێ ئەملا و ئەولا!

ئا بەم شێوەیە ئەم مرۆڤە دروست دەکرێ، لەسەر شێوەیەك، کە نموونەی پێ بهێنرێتەوە، وەك ئەوەی لەناو "ئەسکیمۆ" بەفرگر بفرۆشێت! یاخود خورما لەناو بەردەڵان بفرۆشێ! ئۆتۆمبێلی ڕینۆی لە زێڕ دروستکراو بفرۆشێتە سەرۆك هۆزێکی ئەفریقیا! ئا بەم شێوەیە ئۆتۆمبێلی ڕینۆ لەسەر پشتی حوشتر دروست دەکەن و هەڵیدەگرن و دەیبەن بۆ سەرۆك هۆز، کە لەسەر خاکی ناوچەکەیدا شەقامێکی دوو کیلۆمەتری نییە، ئیتر ئۆتۆمبێلەکەی لەبەردەم قەڵاکەی لغاو دەکات!! بەڵێ ئاوا دروستی دەکەن!! ئێمەش هەستمان نەکردووە ئەم کارە چۆن وای لێهاتووە، تەنانەت دوای (١٠) ساڵێکیش هێشتا پەیمان بەوە نەبردووە، کە بەرامبەر ئەو گۆڕانکاریی و پەرەسەندنانە چیمان دۆڕاندووە؟! ئاخر هەرچ شتێکی ئێرە هی ئەوەیە سەرنجمان بۆ ئەوە ڕابکێشێت کە ئەم مرۆڤە خوداکردە بە ئەندازەیەك ئاستی دابەزێت بە هەرچی پڕوپووچە دڵی بکرێتەوە و دڵخۆش بێت.. ئاخر ئەی مرۆڤ مەگەر چ شتێك هەیە سەرنجت ڕابکێشێ بۆ ئەوەی تۆ بەرامبەر ئەم گەمە و گاڵتە و گەپانە؛ چیت کردۆتە قوربانی؟! گەر چاو و هەست و مەعریفە و گشت چاکە و پێوانەکان لەو بێگانانەوە بێن، ئەوە حەزمان لەو ڕەنگە دەبێ کە ئەوان دەیانەوێ.. تام و چێژ لەو خواردنە دەکەین کە ئەوان پێیان خۆشە، سا ئیتر کێ دەتوانێ بە هۆشمان بێنێ بەوەی دۆڕاندوومانە؟ هەروەها بەوەی کە نادیارە بەرامبەر هەموو ئەم شتانە؟.

بێگومان هۆشیاریی خودی «بێداری» دەتوانێ مرۆڤ بە هۆش بێنێتەوە بەوەی لەدەستی داوە، ئەو مرۆڤەی کە سنووری شوێنکەوتن و بەکاربردنی هەموو ئەوانەی بڕیوە کە باسمانکردن! ئەڵبەت هۆشیاریی کۆمەڵایەتیی دەتوانێ ئەو مرۆڤە بە هۆش بێنێتەوە داخۆ لە نهێنیدا چۆن کاروباری کۆمەڵگەکەی بەڕێوەدەچن! بەڵێ هەردوو هۆشیاریی خودی و کۆمەڵایەتیی تاکە شتن کە دەتوانن مرۆڤ لەم گەوجی و گەمژەییە پەرەسەندووە نوێیە هەستبزوێنە دەرباز بکەن. بۆیە بە ڕاستی ئێمە هۆشیاریی خودی بە بێداریی تاك و هۆشیاریی کۆمەڵایەتیی بە بێداریی کۆمەڵایەتیی ناودەنێین.

## یارمەتیدانی زاڵمان:

چەندێك پیشەسازی پەرەبسەنێت ئەوا هەر ڕێگەیەکی پەلەکردنی دەبێتە زیانگەیشتن بە مرۆڤ و لەدەستچوونی بێدارییە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکەیەتی؛ هەر گەلێکیش ئەم دوو بێدارییەی لەدەستچوو، ئەوا ئەندازیارەکەی چاکترین هۆکارە بۆ هاوردەکردنی کاڵای ئەورووپایی بۆ وڵاتەکەی، پیشەسازییەکەشی ڕێبەری زوڵمە و ڕێگە بۆ داگیرکەر خۆش دەکات، زانایەکەشی کرێگرتەیەکە بە زەبری هێز و پارە کار دەکات، بیر و ڕێبازی کارکردنیشی درێژکراوەی ئامانجی بێگایەنە جا چ لەناو وڵاتەوە بێ یاخود دەرەوە، ئیدی بەم شێوەیە مێشکەکانی جیهانی سێیەم دەبنە دوو بەش! بەشێکیان هەرەتەی دەرەوە دەبن، تاکو لە دامەزراوە مەزنەکان بەکاربێن، هەرچی پێگەیشتن و توانای هەیە لە خزمەت بێگانە بەفیڕۆدەچێ، بێباك لەوەی چی دۆڕاندووە، هەر لە بەرامبەر دوو هەزار تومەنێکی زیادەی سەر مووچە!! بەشەکەی دیکەیش دەگەڕێتەوە وڵات تا لە وڵاتدا ببێتە تابووری پێنجەم بۆ بەکاربردنی کاڵای بێگانە، ئیتر بەمەش ئەرکی ئەدیب، تۆێژەر و فەیلەسووف دەبێتە شەکەتکردن و بەردینکردنی بیر و گۆڕین و دەستکاریکردنی هۆش و ئەندێشە؛ ئیتر پیشەوەر و فیزیاکار و کیمیاکارەکانیش ئەرکیان دابەستەکردن و قەڵەوکردنی ئەوانەیە!!

بەر لە (٣٠) ساڵ لە ئەفریقیا یەك ئەندازیاری ئەفریقی نەبوو، دارایی و سەرمایەدار فەرەنساییەکان لە فەرەنساوە ئەندازیاریان دەهێنا، مانگانەش پەنجا هەزار تمەنیان دەدانێ، بەڵام ئێستا دیارە ویستی خودا وابوو ئەفریقییەکان لەناو خۆیان ئەندازیاریان هەبن و بۆ هەمان ئەو کارە دەست بدەن کە پێشتر بێگانەکانی بە دەوریەوە بوون، چونکە ئەو ئەفریقییانە هەر دوو هەزار تمەن وەردەگرن.!

بێگومان تاکە شتێك کەوا مرۆڤ و ئۆمەت لە نەهامەتیی شەکەتی بیری بە هەردوو شێوازە کۆن و نوێیەکەی بپارێزێت بریتییە لە بێداریی مرۆیی، ئەڵبەت ئەو دینە باڵائاستە لەبارەیەوە دەدوێ کە لە ئاستی زانست تێپەڕیوە، هەروەها لەو کارامەییە کۆمەڵایەتییە تێپەڕیوە کە پەیامی ئاقیدەیی پەیامبەریانە لەبارەیەوە دواوە. پێویستە ئەم دوو کارامەییە ببێتە پێوەری هەموو مرۆڤێك، بە تایبەت بۆ جیهانی سێیەم، لە کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتی و ئیسلامییەکان. ئەگەر بێ ئەم پێوەرانە بڕواننە تەواوی پرسەکان، ئەوا هەموو دۆڕاون. ساختەکارانی ئەمڕۆ

بوکەڵە و گەمە نین، چونکە لە بنەڕەتدا چاو و بینین پێکەوە دروست دەکەن، بۆیە دەربازبوون لە تەڵەکانیان و دەرچوون لە فشارەکانیان و ئاشکراکردنی پیلانەکانیان، پێویستە مرۆڤ چاوکراوە بێت و زانا بێت بە هەر پیلانگێڕییەکی نامۆی ئاڵۆز کە لە دەوروبەریەتی، پاشان بەئاگابێت لەوەی ئاخۆ ئەمان دەیانەوێ چی لەم نەوەیە بکەن!! جا هەر کێ لەمە بێ ئاگا بوو، ئیتر دەبێتە قوربانی چەقۆی دەستی ئەمان، بە فشاری ئەوان ڕێڕەو دەکات، بۆ سەربڕینیشی سەمایان بۆ دەکات!!، بێگومان گێلبوون و دەبەنگایەتی شتێکی زۆر سەیرە و سەمەرەیە، چەشنی ئەم جۆرەی تووشی نەوەکانی تەواوی جیهان بووە، تەنانەت خودی ڕۆژئاواش!. بەڵام خەڵکانی ئەوێ ئەو دەست و کەسانە نین کە لە ڕۆژهەڵاتدا بڕیاری چارەنووسسازانە دەدەن.

# بەشی سێیەم
# کەرکردن

بێگومان هەردەبێ پێوەرێکمان هەبێ بۆ پێوانەکردن؛ دوو چاو، دوو بینین، لێزانییەکی مرۆیی و لێزانییەکی کۆمەڵایەتی. هەر بانگەشە و پڕوپاگەندەیەك یاخود هەر ئاخاوتن یان پێشکەوتن.. هەر شارستانێتی و کولتوورێك و هەر توانایەکی دەرەوەی چوارچێوەی ئەم دوو بێدارییە، هیچ نییە جگە لە بەنجکردنی بیرەکان، تاکو دەستبەرداری مرۆڤایەتی و سەربەخۆیی و ئازادی بن، ئەم بەنجکردن و دەستبەرداربوونەش مرۆڤ دەستەمۆ دەکەن، وەك چۆن کەر دەستەمۆ دەبێ، ئا لێرەوە ناوی ئەم پرۆسەیە دەنێم «کەرکردن».

پاڵنەری ئەم کەرکردنە لە سەردەمی ئێمەدا گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز و بەربڵاو کە بە درێژایی مێژوو هاوشێوەی نەبووە، لە ڕابردوودا کەرکردن لەسەر پێگەیشتنی کەرێنەران و ئەزموونەکانیان وەستابوو، بەڵام ئەمڕۆ پشتەستوورە بە زانست، ئێزگە، تەلەفزیۆن، پەروەردە، فێرکردن، تەواوی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، پێشانگە، دەروونناسیی نوێ، کۆمەڵناسی و دەروونناسیی پەروەردەیی! ئیتر بۆتە هونەر و پیشەیەکی ئامادەساز بە زانستەوە؛ بۆیە لێرەدا ناسین و لێ وردبوونەوەی سەختە.

هەر دۆز و کێشەیەك، جا فەلسەفی بێت یاخود زانستی یان هونەریی پیشەیی، تەنانەت دۆزی پێشکەوتنی کۆمەڵگە و ژیان، گەر لە «بێداریی مرۆیی» و «بێداریی کۆمەڵایەتی» لابدات، ئەوا وەك بانگەشەیەکی درۆین و کوێرانە و ساختە دەمێنێتەوە، ئاکامیشی خافڵاندن و زەبوونی و کۆیلەییە. جا ئیتر مرۆڤ «کۆیلەیەکی نوێ» بێ یاخۆ «کۆیلەیەکی کۆن» چ جیاوازیی هەیە؟ یاخود «کەنیزەکێکی نوێ» یاخود «کەنیزەکێکی کۆن»؛ هیچ جیاوازییەکیان نییە، تەنیا وشەکان لە کتر جودان، بەڵام ئەوەی ناوینراوە کەنیزەك «لاواز» ئەوەی دیکەش «ناسك»، هەرچی واتاکانە هەر یەکن؛ مرۆڤ نین و تەواو!!..

ئیتر واتای کەرکردن بریتییە لە ساختەکردنی هۆش و بێداری و هەست و گۆڕانی ڕەوتی مرۆڤ و لادانی لە «بێداریی مرۆیی» و «بێداریی کۆمەڵایەتی». هەر پاڵنەرێك بۆ لادانی تاك و کۆمەڵگە لەم دوو بێدارییە و دوورخستنەوە لێیان، ئەوا پاڵنەری کەرکردنە! ئەگەرچی زۆرێك لە پاڵنەران پیرۆزکراویشن. هەرچ دوورییەکیش لەم دووانە بێگومان ئاکامەکەی گیرۆدەبوونە بە کۆیلەیی، بوونە قوربانیی هێزی دوژمن و کەرکردن و کەرکردنی ڕەهایە.

چ بەدبەختییەکە نەزانین چیمان لێ داواکراوە!! لابدەین لەوەی پێویستییە وەك تاك و کۆمەڵگە بیری لێ بکەینەوە، بەمەش کەسانی دیکە ئامانجی خۆیان لێمان دەپێکن، ئێمەش هۆش و هەستی پێ ناکەین! هەر لەبەرئەمەیە گوتوومە: گەر لە ساتەوەختی «هەڵوێست وەرگرتن» بە هۆشەوە ئامادە نەبیت، ئیتر لە کوێ دەبیت هەر لەوێ بە. گرنگ ئەوەیە ئامادەی هەڵوێست نیت، دە کوێت دەوێ هەر لەوێ بە، جا بۆ نوێژ وەستاوی، یاخود بۆ مەیخواردنەوە دانیشتوویت، هەر یەك شتە.

داگیرکەران هەردەم بۆ ئەوە بانگەشەت ناکەن، کە چیت لێیان دەوێ، بۆ ئەوەی نەوەکا کەم کەمە بێدار ببیەوە، ئیتر لە دەستیان دەربچێ و بەرەو ئەو شوێنە بچیت کە پێویستە بۆی بچیت! بەڵکو ئەوان خۆیان بە پێی پێویستیان داواکاریی تۆ هەڵدەبژێرن، هەندێ جار بۆ شتێك بانگت دەکەن کە وایدەبینی کارێکی چاك بێت و بە مەبەستی بەدەستهێنانی مافێکی مەزن، جا مافی مرۆڤێك یاخود کۆمەڵگەیەك، یان بۆ سەرقاڵبوون بە مافی کەسێکی دیکە، بەڵام ئەوان بڕیار لەسەر مافی کەسێکی دیکەی خاوەن ماف دەدەن.

کاتێك ئاگر لەماڵێك هەڵدەستێ و کەسێکیش بانگێشتی نوێژکردن و پاڕانەوە لە خودات دەکات، پێویستە بزانی کە ئەمە بانگێشتێکی خائینانەیە، لەبەرئەوەی گرنگیدان بە جگە لە کوژاندنەوە و دامرکاندنەوەی ئاگرەکە و سەرقاڵبوون بە هەر کارێکی دیکە کەرکردنە، گەرچی کارەکەش پیرۆز بێت، جا وەستان بێت لە نوێژ، یاخود سەرقاڵبوون بێت بە موتاڵاکردنی چاکترین کتێبی زانستی و ئەدەبی، یاخود نزا و موناجات بێت لەگەڵ خودا؛ ئیتر لەم دۆخەدا بە هەرچ شتێکەوە سەرقاڵ بیت، واتای وایە بۆتە هۆی کەرکردنت.

هەر نەوەیەك لە پێناو هەر شتێك دەستبەرداری بیرکردنەوە بێت لە «کارامەیی مرۆیی» وەك ئاقیدە و ئاراستەیەکی بیری و ڕەوتێکی ژیان و بزاوتێکی بەردەوام، ئیتر ئەمە کەرکردنییەتی. هەندێ جاران کەرکردن بۆ کاری قێزەون و لادان بانگت ناکات، بگرە بە

پێچەوانەوە بۆ چاکەکاری بانگێشتت دەکات، بەڵام بۆ ئەوەی لە ڕاستییەك دوورت بخاتەوە کە ئەو هەست بە مەترسییەکانی دەکات، تاکو تۆ بیری لێ نەکەیتەوە و نەوەك خەڵکان ئاگادارت بکەنەوە، ئا لێرەوە مرۆڤ خافڵ دەبێت و بەرەو «جوانیی کردەوە» مل دەنێت و بێ ئاگا لەوەی کە پێویستە هۆشیاری بێت، جا ئەمەیە کەرکردنی ناڕاستەوخۆ.

## لە مێژووەوە:

بنەماڵەی عەباسییەکان لە مێژووی ئیسلامدا سیاسەتێکی سەیریان گرتەبەر، بەر لە خەلافەتیان موسڵمانان گەر هەستیان بە مەترسییەك کردبایە کە هەڕەشەیان لێ دەکات، یاخود زوڵمێکیان لە خەلیفە یاخود خزمانی بدیتایە، ئیتر دەستیان لە کار و پیشەیان هەڵدەگرت و وازیان لە بازاڕەکان دەهێنا و ڕوویان دەکردە مزگەوتەکان، هاوار و سەدایان بەرزدەبۆوە و داوای سەرفرازیان دەکرد، داوا دادگەیی و دادپەروەرییان لە خەلیفە دەکرد! ئەمە هەستی کۆمەڵایەتیی موسڵمانان بوو لە کاتی پێغەمبەر (دروودی لەسەر بێ) و لە سەردەمی (ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان و عەلی)، تەنانەت لە سەردەمی بنەماڵەی ئەمەوییش! ئیتر خۆ ڕوونە حوکمداریی ئەو جۆرە خەڵکانە وا بە سووك ئاسانی ناکرێت، لەگەڵ ئەو بوێریی و مەردایەتییان ئیتر زوڵم و زاڵبوون بەسەریاندا سەختە! ئەوانە خودان کارامەییەکی کۆمەڵایەتی و مرۆیی بوون!! بۆچی؟ چونکە موسڵمانبوون و لە ڕووی کۆمەڵایەتییشەوە زۆر بە توندی پابەندی ببوون، کە گوێیان لە بانگ دەبوو ئیتر ڕاکەڕاکەی نوێژیان بوو، تاکو سەرزەنشتی خۆیان بکەن و بیر لە چارەنووسیان بکەنەوە، ئەوسا خەلیفە عومەریان بینی، ئەو ئیمپراتۆرەی فەتحی میسر و ئێران و وڵاتی ڕۆمی بۆ کردن، جلێکی وای لە دەستکەوتەکانی جەنگ لەبەرکرد تۆزێك لە جلەکانی وان درێژتر بوو، ئیتر دەنگی ناڕەزاییان بەرزبۆوە، داوایی یەکسانییان لە دابەشکردنی دەستکەوتەکان کرد، بە دەنگی بەرز گوتیان: لەبەرچی جلی تۆ لە جلەکانی ئێمە درێژترە؟ ئەڵبەت لەلایان هیچ جیاوازییەك لە نێوان عومەری سەرکردەیان ئیمپراتۆری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و نێوان سەربازێك لە سەربازەکان نەبوو. سەرەتا ناچاریان کرد بە دادگەریی لەبری ئەوەی بە باڵایدا بڵێن و بەرزی بکەنەوە، چونکە فەتحی ئێران و ڕۆمی کردووە، نەخێر داوای دادپەروەرییان لێی کرد!! بڕوانە هەستی ئەم ئۆمەتە و بایەخدان و گرنگیدانیان بە چارەنووس و دواڕۆژیان، بۆیە ئەوانە دەتوانن بە سەری پەنجان ئێرانی خاوەن شارستانی سەردەمی ساسانی بەرزبکەنەوە و چۆن و

کوێی بیانەوێ لەوێدا بنێن، هەرواش بوو ڕیشەکێشیان کرد و کەس نازانی بۆ کوێ چوو!!
هەر لەبەرئەمەش بوو توانایان هەبوو تەواوی وڵاتی ڕۆم فەتح بکەن و توانیان فەتحی میسر بکەن و بە سێ هەزار پیاو کۆنترۆڵی بکەن. خەڵکانێك بوون ڕەوتی مێژوویان گۆڕی، بە پەرۆش و وردبینانە بایەخ بە دوارۆژیان دەدەن!!

"عومەر"یان ناچارکرد بێتە مزگەوت، تاکو خۆی وەڵامی خەڵك بداتەوە، نەك نوێنەرێکی یان وتەبێژێکی!!! ئینجا "عەبدوڵڵا"ی کوڕیشی وەك شاهێد لەگەڵ خۆی هێنا، تا بە خەڵکەکە بڵێت: بەشە قوماشەکەی خۆم لەبەر بەرزی باڵام بەشی جلێکی نەکردم، ئیتر عەبدوڵڵای کوڕم بەشە قوماشەکەی خۆی دامێ، جا خستمە سەر ئەوەی خۆم تا ئەو جلەم پێ دروو، دەشتوانن بمان پشکنن و لێمان بپێچنەوە، کەسانێکتان بە نوێنەرایەتی ئێوە بچن لێ پێچینەوە بکەن چۆن بتانەوێ؛ "عەبدوڵڵا" هیچ بەشێکی لەو دەستکەوتەدا نەبووە..ئیتر ئاوا "عومەر"یان بینی دوای لێ پێچینەوە...

دەی ئیتر دیارە خۆ حوکمکردنی ئەوانە وا ئاسان نییە، هەر دەبێ ئەم «لێزانییە سیاسییە»ـیان لێ دابڕێنرێ کە "ئەفلاتۆن" باسیکردووە، هەروەها ئەو «لێزانییە کۆمەڵایەتییە» پێغەمبەرییە ڕۆشنەیان لێ زەوت بکرێ کە باسمکرد..گەر ئەمەیان لێ زەوتکرا، ئیتر دوای ئەمە هیچ شتێکی مەترسیدار نامێنێتەوە، گەر بشیانەوێ ببنە زانا یاخود فەیلەسووف ئەوا هیچ بایەخی ئەوتۆیان نییە، گەر نیوەیان وەك "عەلی ئیبن سینا" بێ و نیوەکەی دیکەیشیان وەك "حەلاج" ئەوا گشتیان هیچ نین، جگە لە خزمەتکارانی خەلیفە..مەگەر "ئیبن سینا" کە ناوبانگی دنیای داگرتەوە هەر نووسەری کتێبی «جلالەت ئەلخاقان» نییە؛ دیارە خۆ گەر ئەم هەستەی نەبایە ئەوا زۆر پەسندتربوو! بەڵێ..گەر مرۆڤ ئامانجێکی نەبێ ئیتر ئاوای لێ دێت، نە زانستەکەی سوودی بۆ دەبێ، نە هونەر و نە پێگەکەیشی.

ئەدی کەڵە زانایانی هونەرە جوانەکان و دەست ڕەنگینان چی؟ دەیانبینی «عالی قابو» و «هەزار و یەك شەوە»(ألف لیلة و لیلة) بەرهەم دێنن لە ماڵی خەلافەت لە بەغدا !!، ئاساییە گەر نەشمان بووایە ئەوە چاکتریش بوو! دەی کەواتە سوودی ئەم هونەر و زانستە چییە؟.

ئینجا.. سەردەمی بنەماڵەی عەبباسی دێ، «جەعفەری بەرمەکی» زەماوەند لەگەڵ «عەباسە»دا دەکات[٥]، خواردنی زەماوەند ئامادەکرا!! هێندە خواردنیان زۆر لێ نابوو، چەند ڕۆژێك بەرماوەکەی هەر لە بەغدا مایەوە، دوای ئەوەی تەنانەت باڵندە و ئاژەڵانیش چەند ڕۆژێك لێیان خوارد، ئیتر بەرماوەکە بۆگەن بوو، جا ناچاربوون کرێکاریان بۆی هێنا تا بەرماوەکە لە شار دوور بخەنەوە!! کەچی یەك پیاو لە موسڵمانانی تەواوی کۆمەڵگەی ئیسلامی نەبوو بڵێ: ئاخر ئەم هەموو خۆراکە لە دیندا زێدەڕۆییە.. بەڵێ کەس ئەمەی نەگوت نە زانایەك نە فەقیهێك نە شاعیرێك نە هۆشیارێك نە پێشەوایەك نە پاشەوایەك...ئاخر بۆچی؟، چونکە »لێزانیی سیاسی»یان نەبوو.!

ئەڵبەت ئەوانەی هیچ بایەخێکیان بەم لێزانییە نەدەدا، پێکەوە کۆدەبوونەوە و گفتوگۆیان دەکرد، ڕایاندەبوارد و ئاهەنگیان سازدەکرد، لەبەرئەوەی داخۆ ڕێسایەکی ڕێزمانییان بۆ زمانی عەرەبی دۆزیوەتەوە یاخود کتێبێکیان لەسەر پزیشکی و دەرمانسازی دەستکەوتووە و دەیانەوێ وەریگێڕن تاکو بە قورسایی کتێبەکە زێڕیان دەستکەوێت!! ئیتر ئاوا.. تۆژینەوە فەلسەفی و زانستییەکان لە سەردەمی بنەماڵەی عەباسییەکان لە برەودا بوون!!. جگە لەمە ئەوانە هیچ هەستێکیان سەبارەت بە دوارۆژی کۆمەڵایەتییان نەمابوو؛ سەرەنجام ئەوێ ڕۆژێ مەغۆل هاتنە ناوەوەی وڵات و ڕایماڵی، هیچی بۆیان نەهێشتەوە نە شارستانی نە هێز و توانا نە زانست نە هیچی دی؛ چونکە «لێزانیی کۆمەڵایەتی» لە قەیراندا بوو، بۆیە دەبینین پاڵنەری داگیرکردن لە سەردەمی بنەماڵەی عەبباسیدا زانست و شارستانی و هونەر و ئەدەب و لێکۆڵینەوەی زانستی و هونەری و ئەدەبی و نائەدەبی بوو.

---

(٥) عەبباسە خوشکی هارونە ڕەشیدی خەلیفەی عەباسییە.. وەرگێڕ.

# بەشی چوارەم
# جۆرەکانی کەرکردن

کەرکردن دوو جۆری هەیە: کەرکردنی کۆن و کەرکردنی نوێ، ڕێك وەکو داگیرکردنە؛ ئەویش کۆنی هەیە و نوێی هەیە. وەك باسمان کرد کەرکردن پاڵنەری لادانە، یاخود جادووکردنە لە بیرکردنەوە و بێ ئاگاکردنییەتی لە (لێزانیی مرۆیی و لێزانیی کۆمەڵایەتی)، و سەرقاڵکردنییەتی بەوەی ئەوە ڕاستە یاخود ئەوە پووچە، ئەوە پیرۆزە یاخود پیرۆز نییە.. ئەوە پێناسەیەکی گشتگیری کەرکردنە.

دین پاڵنەرێکی بەهێزی کەرکردنی کۆنینە بوو، بەڵام پاڵنەری کەرکردنی نوێخواز بریتییە لە هەموو شەڕ و شۆڕ و جەنگێکی فریودەری درۆزنانە، ئەو هۆکارانەشی لەم بوارەدا بەکاردێنرێن بریتین لە:

لە «کەرکردنی کۆن» سوود (لە زوهد "تەرکەدنیایی"، ئەخلاق، تەسەووف، شیعر، نەتەوەپەرستی، زلکردن، بەرزنرخاندنی ڕابردوو، سوپاسگوزاری، پاداشت، شەفاعەت، گەیشتنی تاکەکەس بە بەهەشت و چوونە ناویەوە و...هتد) وەردەگیرێت، بەڵام لە «کەرکردنی نوێ» سوود (لە پسپۆڕی، لێکۆڵینەوە، زانست، توانا، پێشکەوتن، ئازادیی تاك، ئازادیی سێکسی، ئازادیی ئافرەت، لاسایی و بەدواکەتن) دەبینرێت.

## دینی کەرێنەرانە:

دوای تێپەڕبوونی ماوەی هاتنی پێغەمبەرانی شکۆمەند کە بە ڕوونی و ڕاستگۆیانە لەوپەڕی ڕاستیدا دینیان گەیاند، بەڵام پاشان چارەنووسی دین کەوتە دەستی هێزە کەرێنەرەکانی دژ بە مرۆڤەکان، جا بە ناوی جیاجیاوە وەك: چینی ڕۆحانی، چینی مەعنەوی، چینی سۆفیگەری، چینی ڕەبەنان (ڕاهیب)، چینی قەشەکان و...هتد، ئەوانەش دینییان کردە ئامرازێك بۆ کەرکردنی خەڵك بە تاك و کۆ، کەچی خودی دین بەرز

و بڵنـدیان دەكاتـەوە، بـە تایبـەت ئیسـلامی پـاك كـە «لێزانیـی مرۆیـی» و «لێزانیـی كۆمەڵایەتی» و «لێزانیی تاك» دەگرێتەخۆ..

تەوەری قسەكانم لێرەدا لەبارەی دینی كەرێنەرانەیە، دینی گومڕاكەر، دینی دەسەڵات، هاوبەشی هێز و دارایی، ئەو دینەی چینیە ڕەسمییەكان لایەنگرین، پسووڵەی دینیان لایە و مۆڵـەتی پەیـداكردنیان هەیـە، نیشـانەی تایبـەتیان هەیـە بـەوەی گوایـە پـارێزەری دیـنن و بانگخوازن..

لێرەدا پرسیار ئەوەیە: لە پێناو چی ئەو دینە مرۆڤ وەكو كەر دەستەمۆدەكات؟ بگرە ئەو دینە چی لە مرۆڤ دەكات دوای كە كەری دەكات؟ بۆ زانیاریی لە توانای دینـدا نییـە كـە «بێداریی تـاك» و بەرپرسـیارێتیی لـە چارەنووسـی و كۆمەڵگەكـەی لـە مـرۆڤ بسـەنێت. ڕەنگـە پێت بڵێت: واز بێنـە لـە دنیـا، چونكـە سـەرەنجام هـەر مردنـە، ئیتـر گشت ئـەو داوا و هەست و ئومێدانـەی هەتـە هـەڵیگرە بۆ دوارۆژ.. بۆ دوای مـردن! زەمەنەكـەش هێنـدە نییـە، ئەوپەڕی سی یاخود چل یاخود پەنجا ساڵێكی بێ بەهایـە!! ئیتـر دوای ئەمـە هـەموو شتێك لەژێر ویستی تۆدا دەبێ، تۆ لەوانە دەبی كەوا لەو خۆشیانەدا بە نەمری دەمێننەوە، ئیتر واز لە دنیا بێنە بۆ كەسی خۆی!! بێگومان مەبەستی لە كەسی خۆی، خودی خۆیـەتی...ئیتر ئەم جۆرە دینە بەرپرسیارێتیم بەرامبەر كۆمەڵگەكەم لێ زەوت دەكات بە دوو ڕێگە:

یەكەم: ئەو توانا و بەهرانەم لێ دەبات كە هەمە و قەدەخەی دەكات لێم، هـەر كـە لەسـەرم پێویست بێ لە پێناو دادپەروەریدا زوڵم ڕەت بكەمـەوە، ئـەوا دینـی كەرێنـەر داوای بێدەنگبوون لە زوڵم و هەژاری و ئارامگرتنم لێ دەكات؛ حەواڵەی پشتبەستنم بە «عەبباس»[٦] دەكـات، بەمەش هیچ بەرپرسیارێتییەكم لە ئەستۆدا ناهێڵێت.!!

دووەم: كـە خـۆم دەبیـنم بـە كەمتەرخـەمی، خیانەتكـار، سـووكایەتی و خراپـەكار لەگـەڵ كۆمەڵگـە و چارەنووسـی، ئیتـر دەكەومـە ژێـر فشـاری ویـژدانم، «لێزانیـی كـۆمەڵایەتیی» ناچاری ئەوەم دەكات كە مافی خەڵكان بۆ خۆیان بگەڕێنمەوە و داوای لێبوردنیـان لـێ بكـەم لەوەی لە ئاستیان كردوومە، بەڵام تۆ ناتوانی مافەكانیان بۆ بگەڕێنیتەوە، ئەڵبەت خۆ ئەمـە ڕاست و تەندروست نییـە! بەڵام ڕێگەیـەكی ئاسـانتر هەیـە.. ئـەویش: ڕوو لـە قیبلـە بكـەیت

---

(٦) عەبباسی كوڕی عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب، لە كەربەلا لەگەڵ حوسێنی برای (س) شەهیدبوو...نووسەر لەناو عەوامـی خۆشـمان ئەوە هەیە بەتەمـای خـودا لێـی گەڕێ.. ئینجـا ئەو پشتبەسـتن و هـاواكردنە شـێخ و پیاوچـاك و ئیمامان بە جۆرەك لە جۆرەكان لەناو زۆربەی پێكهاتە ئیسلامییەكاندا هەیە.. وەرگێڕ

چەند وشەیەك شەش جاران بخوێنیەوە.. پاشان ئیدی هیچت لەسەر نامێنێ.. لە تەواوی تاوانەکانت دەبووردرێ و شەفاعەت و بەخشین و میهرەبانیت دەست دەکەوێت.!

بەڵێ! خودای ئەم دینە بە ئاسانی لە هەموو خراپەکاری و کردەوەی قێزەون ناپەسند دەبووری، هەر بە تاکە فووێك تاوانەکانت دەسڕێتەوە، تەنانەت گەر بە ئەندازەی خاك و خۆڵی دۆڵەکان و ئەستێرەی ئاسمانەکان بێت!! تۆش دەپرسی: ئێ بۆچی قورسایی بەرپرسیارێتی هەڵگرم، گەر ئەرکی من بەرامبەر خەڵك و ژیانیان پێویست بەوە بکات لە پێناویان بمرم و لە پێناویان قوربانی بە خۆم بدەم! ئێ ئەمە بۆ؟ خۆ ڕێگەیەکی ئاسانتر هەیە، ئەویش «کتێبی دوعایان"ـە کە دەرگەی بەهەشتەکانت بۆ دەکاتەوە، بێ ماندووبوون و شەکەتی و بێ کۆشش و خەباتی بیری، دواجار بێ هیچ بەرپرسیارێتییەك.

ئەوە دینی کەرێنەرانەیە، کە پێت دەڵێ: ئەوەندەت بەسە، کە خۆشی بخەیتە دڵی کەسێك یاخود پێویستی یەکێك دابین بکەی، هەتا گشت تاوانەکانت بسڕێنەوە و خراپەکانت بە چاکە ئاڵوگۆڕ بکرێن و سەرجەم بەرپرسیارێتییە کۆمەڵایەتییەکانیشت لەسەر لابچن..

بە کورتی: دینی کەرێنەرانە تەواوی مافەکانم دەداتەوە، دوای مردنیش لەوانەی دەسەنێتەوە کە زوڵمیان لێ کردووم، ئەمە سەبارەت بەخۆم وەك مەزڵومێك، بەڵام ئەگەر زاڵم بم، ئەوا فێری ئەوەم دەکات کە چۆن مەزڵوم ڕازی بکەم، بگرە لەسەرمە کە داوای ڕەزامەندیی دۆستانی خودا و دین بکەم!! ئیتر ئەمانە ڕەزامەندیی خۆیان دەردەبڕن بە نوێنەرایەتیی تەواوی ئەوانەی زوڵمم لێ کردوون، بگرە بە نوێنەرایەتیی خوداش، چونکە چوونە ناو بەهەشتم بۆ مسۆگەر دەکەن..

لێرەوە دەبینین دین لادانی و شێوێنراو بانگی هەردوو لایەنی زاڵم و مەزڵووم بەرەو کەرکردن دەکات، تەواوی دۆز و کێشەکان دەگۆڕێت بۆ پرسی زەینی، لادانی بەرپرسیارێتییە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر شانی گشت چاك و خراپێك دەخاتە ئەستۆی خۆی و بە ئاسانی و بە فڕوفێڵێکی تایبەت! کەس پێی نازانی جگە لە دۆستە ڕەسمییەکانی خودا و ناوەندە ڕاهێنراوە ڕەسمییەکان!!

## زوهد (تەرکە دونیا):

ئەمەش جۆرێکی کەرکردنە، بەوەی فەرمان بە مرۆڤ دەکات کە واز لە مافە کۆمەڵایەتییەکانی بێنێت و پێویستییە سرووشتییەکانی بخاتە لاوە، هەر پەتی هیوا و ئومێدی بە مافەکانیەوە بپچڕێنێت! ئیدی مرۆڤ تەنیا پێوەست بە پێویستیی وا زۆر سادە بمێنێتەوە کە هەر هێندەی پێویستییەکانی ئاژەڵ بێت. هەروەها لێزانیی دەروونی لە تاك زەوت دەکات و مافی لە چێژبینین وەك مرۆڤ وێران دەکات بە سەرجەم بەهرە بەخششە خوداییەکانەوە کە لە دنیادا بۆ ئەو دروستکراون، بۆ کەسیش نییە لەو مافەی دایببڕێت. دواجار ئەم زوهدە دەبێتە فێڵێك لە خاوەنەکەی بۆ گۆشەگیربوون و قەناعەتکردن و ڕازیبوون بە کەمە خۆراکێك، بە کورتی؛ بانگی تەواوی خەڵك دەکات بۆ وازهێنان لە مافەکانیان لە ناز و خۆشی دنیا بۆ بەرژەوەندیی دوژمنانیان، خۆ ئەم مافانە بناخەی تەماحگیری و چاوتێبڕینن، بۆیە دەبینین زوهد هۆکارێکی جێبەجێکردنی زوڵمە.

## شیعر:

تێبینی نموونەیەکی شیعر لە کتێبك بکەن کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوەساڵی ٦١٨ی کۆچی ئەو ساڵەی مەغۆل هاتنە ناو ئێران و شاری "بەلخ"یان وێرانکرد و تەواوی باکوریان تالانکرد و ئێرانیان وا جێهێشت کە لەناو گۆمی خوێن مەلە بکات، لەو بارەوە نووسەرێك دەڵێت: «من هەڵاتوو و ڕاکردووم، بەڵام ئێمە لە دۆخی ڕاکرنداین، چونکە مەغۆل بۆمان هاتن..وا ئێمەش ڕادەکەین بۆ دەبازبوون!»، لەم ڕەوشە و لەم دۆخەدا، دانەری وا هەبوو خەریکی داڕشتنی شیعر بوو! داخۆ تا چەند دەتوانێ فروفیشاڵی لەخۆباییبوون بەرزتر بکاتەوە، تا چ ئەندازەیەك پێیەوە دڵنەوا و دڵارام دەبێت! بابای شاعیرمان دەهات یەك چامەی سەد دێڕی دادەڕشت، وشە و دەستەواژەکانی لەسەر ڕیتم ڕێکدەخست، کە دەتخوێندەوەش دەتبینی چامەکە لە پێداهەڵدانی خاقانە، ئەگەریش بە جۆرێکی دیکەیش بیخوێنیتەوە دەبێتە دڵداری...ئا ئەمەش جۆرێکی داڕشتنە پێی دەگوترێ «داهێنانی باڵندەییانە» لە باڵندەوە وەرگیراوە..

ڕەنگە چامەکە لەسەر شێوەی درەخت بێ، وەك ئەوەی وشەکان لە شوێنی لق و پۆپ و گەڵێ و بەری دارەکە دانرابن، بەمەش شیعرەکە دەبێتە چواری لە وەسفی خودان (مولی)؛

بەم داهێنانەش دەگوترێ داهێنانی درەختاندن کە لە درەختەوە وەرگیراوە. ئینجا دوای ڕێکخستنەوەی وشەکانی لەسەر شێوەی چێڵ یان کەر گەر چامەکە بخوێنیەوە ئەوا دەبێتە پێداهەڵدانێك بە خاقان! جا لەگەڵم حیساب بکەن، داخۆ مرۆڤ چەندی کات پێویستە تا حەفت یاخود هەشت چامەی دڵداری و چوارین تێکەڵێوی یەکدیی بکات بۆ ئەوەی داهێنانێکی جیاواز بۆ خەڵك بخاتەڕوو! بێگومان ئەم کارە پێویستی بە بلیمەتی و وریایی پتر هەیە، تاکو شاعیر بتوانێ چامەیەکی وا دابڕێژێ، کە شوێنی وشەی دووەمی یەکەم دێڕی هەمان شوێنی دووەم وشەی بیستەم دێڕی چامە دڵدارییەکە بێت، وشەی یازدەمینی نیوە دێڕی حەفتەمی سەرەتای شیعرێکی چوارین و وشەی سێیەمی نیوە دێڕی حەفتەمی سەرەتای شیعرێکی پێنجینە هاوشوێن بن (ئەمە وێڕای کێشی تایبەت و ناوەڕۆکی تایبەتیی هەر جۆرێکی ئەم دارشتنانە!). تا ئێرە کێشە نییە، بەڵام سوودی ئەم کارە چییە؟ لەو ساتەوەختەش جەنگیزخان بە درێژایی و پانایی وڵات تێ دەسوڕایەوە و تالانی دەکرد و دەیسووتاند و دەیکوشت، ئەو شاعیرەش ڕایدەکرد تا خۆی دەرباز بکات، لە حاڵێك گەر دەربازی دەبوو، ئەوا خەریکی ئەم کارە دەبوو؛ لەگەڵم بڕوانن داخۆ چۆن مرۆڤ خۆی قێزەون دەکات، مەگەر ئەوە بوون بە قوربانی کەرکردن نییە؟!

لە تارانیش شاعیرێکی زمانپاراو هەبوو بە زمانی عەرەبی شیعری دادەڕشت؛ بەڵام توانای داڕشتنی شیعری نەتەوەیی و حەماسییانە و بەکارهێنانی شێوازی داهێنەرانەی نەبوو، لە هەمان کاتیشدا سەرۆکی نووسینگەی بەڵگەنامە و هاوسەرگیری و تەڵاق بوو، کاتێك هەوڵی دەدا کە شیعرێك لەسەر بابەتێك دابڕێژێت و ئیدی سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە چووە سەر ئەوەی تەواوی داواکارییە نووسراوەکانی فەرمانگەی گشتیی تۆماری بەڵگەنامەکان کۆبکاتەوە کە لە نووسینگە ڕەسمییەکانیدا لە سالانی ١٣٢١ ــ ١٣٢٧ بڵاویکردبۆوە، واتە ئەو ماوەی کە ئێران لەژێر فشاری داگیرکاری چوار سوپای بێگانە دەینالاند!! ئا ئەوەیە تووشبوون بە دەردە شیعر! دەی بڕواننە ئەو ماوە کاتییەی نێوان سالانی ئەو سالانە دەبینی چارەنووسی ئێران و حومکداری و جەنگە ناوەخۆیی و دەرەکییەکان و لایەنە ناکۆکەکانی؛ لە گرنگترین ڕووداوەکانن، کەچی ئەو شاعیرە خۆی تەرخانکردووە، بۆ ئەوەی تا ئەم کارە هونەرییە جوانە بخاتە بەر دیدی کۆمەڵگەکەی! بێگومان ئەمە کەرکردنە لە ڕێی شیعرەوە!

## نەتەوەپەرستی:

لە سەردەمی هیتلەر کلۆڵی و هەژاری ئەڵمانیی وا هەبوو کە گازی لە«بابۆڵە»(سەندەویچ) دەدا و بە شانازی و لووتبەرزییەوە دەیگوت: من ئەوپەڕی پێداگیری لەسەر جەنگ دەکەم! گەر لێیمان بپرسیبایە: لەبەرچی دەجەنگی؟؟ وەڵامی دەداوە: لە ئەمەریکا پێنج ملیۆن بە ڕەگەز ئەڵمانی هەن، دەمەوێ بیانگەڕێنمەوە ئەڵمانیا، بۆ ئەوەی نەوەك ڕەگەزیان خەوشی تێ بکەوێت و تێکەڵاوی نەتەوەی دی ببن.!

بە ڕاستی ئەمە گەوجاندنە؛ خۆ وا لە نەبوونی و کەساسی و لە برسان دەمرێت، هەر هەستیش بەمە ناکات، نەك هەر ئەمە، بگرە هەست بە مەودای کاریگەریی ئەو پڕوپاگەندە ساختەیەش ناکات کە لەسەریەتی، جا دەیەوێ پێنج ملیۆن تاکی بە ڕەچەڵەك ئەڵمانی لە ئەمەریکا دەربێنێ و بیانگەڕێنێتەوە ئەڵمانیا، بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕەگەزەکانی دیکە تێکەڵ نەبن، چونکە پڕ خەوش دەبن، هیچ ئیشوکاری نەماوە جگە لەمە، بێگومان کەراندن و کەرکردن لەسەر دڵی دایکوتاوە.!

## شانازیی و خۆهەڵکێشان بە ڕابردوو:

ئێرانییەك و میسرییەك قسەیان دەکرد و شانازییان بە ڕابردوویان دەکرد. میسرییەکە خۆی هەڵدەکێشا و شانازی بە هەرەمەکان و گۆڕی فیرعەونەکانەوە دەکرد، کە لاشەی وا دەردێنن بەر لە پێنج هەزار ساڵ لە گۆڕنراون، ئینجا دەیهێننە پێشانگەکان وەك «نموونە» نمایشیان دەکەن، بێ ئەوەی بیری ئەوە بکەنەوە کە ئەو خوالێخۆشبووە لە ژیانیدا چ کوڕە میکرۆبێکی قێزەون بووە!! ئاخر چۆن مردنەکەی دەبێتە نموونەیەك!. بابای میسری هاوڕێ ئێرانییەکەی دەدواند[٧] و گوتی:

---

(٧) دەی ئاخر بەچی مرۆڤ لەخشتەببەن، ئەوەی لێ ونەدەکەن کە ئێستا جێی شانازیە، توانا هەنووکەییەکانیشی زەوتدەکەن، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن کەچی شانازیدەکەن! عێراقی گوتەنی بڕواننە ئەمە شاعیری وەرزی و وەختیە، لادەر و بەرەڵای بەدئەخلاق لە ولاتدا دەخولێتەوە، بچێتە هەر ولاتێك وەك خۆی گەند و گەنی دەکات، هەر کاتێ داوابکرێ ڕادەکاتە ولاتێکی تر ئەوێش وا لێ دەکات، ئیتر ئەمە خوویەتی، بەڵام ببینن چۆن ڕێزێکی لێ دەگیرێت و بەرز دەنرخێنرێت! ساڵانە جارێك دیوانە شیعریەکەی چاپدەکرێتەوە، هەموو شەوێ لە ئێزگە و تەلەفزیۆن دەخوێنرێتەوە، لە لێکۆڵینەوەشدا شیعر و ئەدەبی وی پێشەنگە؛ کەچی چەندین توانای زیندووی شیعری و ئەدەبییمان هەیە بێ‌ئەوەی کە پەیوەنداران بایەخی پێ بدەن و هاندەری بن؛ ئەمە لە کاتێکدا لە ڕووە ئەدەبی و مرۆییەکانەوە زۆر بەهادارتر و بەنرختر و

دەگوترێ کەوا لە هەرەمەکانمان بەکرە و داو و تەلیان دۆزیوەتەوە، پاشان ڕوون بۆوە کە ئێمە ئەوساکە دەزگەی هەواڵگریی تەلدار (سلكي)مان هەبووە! هاوڕێ ئێرانییەکەی وەڵامی دایەوە: ئێمەش لە ئێران چەند لە شوێنەوارەکانی (تەختی جەمشید)مان کۆڵیوەتەوە و پشکنیوومانە هیچ شوێنەوەرای بەکرە یاخود تەل یان داومان نەدۆزیەوە، لێرەوە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئێمە ئەوسا دەزگەی هەواڵگریی بێتەل (لاسلكي)مان هەبووە....!

ئێمە دڵخۆشین بەم شتانە و وا شانازی بەو دۆزە نەتەوەپەرستییە وێرانکاریانەمان دەکەین! هەزاران سەرچاوە و ڕشتەی مێژوویی و زانستییمان لەبارەی شارستانێتیی ئیسلامەوە هەیە، ئێمە دەیزانین و تەواوی جیهانیش پێی ئاشنایە، ئێمەش هەموو شاهێدین لەسەر تواناکانی تاکی ئێرانی، بەڵام خۆهەڵکێشان بە ڕابردوو و پەنابردنە بەر قەزا و قەدەر و شەفاعەت و پاداشت و سوپاسکاری و شڵەژانی دەروونی و گرێی گوناهکردن و بردنەوەی تاکخوازانەی بەهەشت..تەواوی ئەمانە ئامرازەکانی کەرکردنی کۆنینەن، گشتیان وا لە مرۆڤ دەکەن هەر خۆی تەنیا بە دوای کاری خۆیدا بچێت و لە خەڵکی داببڕێت، بە دوای کتێبانی نزاکردن بگەڕێت بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەك کە هەر خۆی بچێتە بەهەشتەوە! دەی ئەمە مەزنترین کەرکردن و گەورەترین بەڵا و کارەسات تووشی کۆمەڵگەکان بێت ئەوەیە لە ڕێگەی دینە دەستکردەکانەوە بکەویتە چاڵی کەرکردنەوە.

## سوپاسگوزاری:

مەبەستم لەو سوپاسگوزارییە نییە کە دینی ڕاست و تەندروست و دینی مەعریفە ڕامان دەسپێرێت، کە گوزارشتە لە لێزانیی مرۆڤ و وەستانی لەسەر بەهاکانی و پێزانینی بەخشش و ئەو بەهرانەی هەیەتی، بەڵکو مەبەستم لەو سوپاسگوزارییەیە، کە فەلسەفەی دینی ساختە دەیڵێت، واتە سوپاسگوزاریی لەسەر کلۆڵی و کۆیلەیی، ئەو سوپاسگوزاریەی بریتییە لە فەلسەفەی دەستەوەستان و گەلۆری! وەك ئەو سوپاسگوزارییەی ئەو پیاوەی، کە بڵێ «سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە گوێیەکانمانی لە بن هەنگڵمان دانەناوە»!!. بە ڕاستی ئەوەیە

---

بالاترە لەوەی ئەو دابەزیوە گوتوویەتی. بەڵام پشتگوێخراوە و فەوتاوە، بێبایەخ و بارودۆخی دارایی و هی تریش هیچ ڕێیەکی پێ نادات، بەم چەشنە خاوەنی ئەم توانایانە بەناچاری شەو و ڕۆژ قەڵەمەکانیان دەخەنەکار تا خۆیان و ماڵ و منداڵیان لە برسییێتی دەربازبکەن، دوور نییە کەسێك بیانکاتە دەرگەوان! یاخود ژمێریاری کۆمپانیا! ئێ بۆچی؟ چونکە بەها و نرخی شتەکان بەرز و بڵند دەبێتەوە بە گوێرەی کۆنیی!!

نەهامـەتی و کلۆڵی، چونکە بەخششێکی نەدۆزیەوەتـەوە، جگـە لەمـە تـا سوپاسـی خـودای لەسەر بکات، بە دوای هەر شتێکدا دەگەڕێت کە سوپاسـی خودای لەسـەر بکات، دەی چ دەبـوو گـەر گوێمـان لـە بـن هـەنگڵمان بووایـە؟ ناچـاربووین باسـکمان بەرزبکەینـەوە هەرکـە یـەکێکمان ئاخاوت تـا ببسـتین چـی دەڵـێ؟!!، جـا چۆنییەتەکەشـی زۆر پێکـەنیناوی دەبـێ، بەڵام ئێتسـا بـێ ئـەوەی جووڵـە بکـەین و وەسـتاوانە دەبیسـتین، دەی سـوپاس بـۆ تـۆ ئـەی خودایە.!!

هاوشێوەی ئەمە، وەك ئەوەی کەسێك خواردنێکی قێزەون بخوات و سوپاسـی خـودا بکـات! یـەکێکیش بیبیسـتێ و پێـی بڵـێ: شـەرم ناکـەیت؟ لەسـەر چـی سوپاسـگوزاریت؟! ئـەوەش شـتێکی سـەیری بیرهێنامـەوە؛ پیـاوێکی دینـی بـەناوبانگ، مـانگی ڕەمـەزان هـەموو ڕۆژ بەسـەر مینبـەر دەکـەوت بـۆ دەستکەوتنی پاداشـت، هـەموو جارێکیش ڕۆژانـە کـە سوپاسـی خودای دەکرد وەك ئەوەی بەشێکی سی بەشی سوپاسگوزاری بێت، جا هـەموو ڕۆژێکیش بەخششێکی نوێی دەدۆزیەوە!!، جا گەر کەسانێکی عـەوام ڕۆژێك لێیان بپرسیایە لەسـەرچی سوپاسـی خـودا دەکـەی؟ وەڵامـی دەداوە: سبەی ڕۆژی زیندووبوونەوەیـە، گـەر فریشـتەکانی سزادان هاتن و لێتانیـان پرسـی: بۆچـی گوناهتـان کـرد خۆ خـودا ئـەقڵ و هەست و هۆش و هێـز و بیـر و توانـای پێـدابوون؟ ئێـوەش عـەوامن و نـازانن چـۆن وەڵام بدەنـەوە، بۆیـە دەبـێ سوپاسی خودا بکەن کە مرۆڤی وەك ئێمەی خەڵقکردووە.!

بۆ بەیانی ئـەو پیـاو چاکـە! دەهاتـەوە و بەسـەر مینبـەر دەکەوتـەوە و هـەڵڵای بـەو خەڵکـە دەکـرد بـۆ سوپاسـکردنی خـودا، گـەر لـە هۆکـاری ئـەو سوپاسـگوزارییەیان بپرسـیبایە؛ وەڵامیدەداوە: وا دابنێن یەکێکتان شەوێك لە شەوانی هاوین لە سـەربانی ماڵەکـەی دانیشـتووە، جامێکیش سکنجبینی[(٨)] لە پێش خۆی داناوە، ئینجا ئارووێك و هەندێك دەنکە کەنـەباس[(٩)] تێك بکات، پاشان پارچە سەهۆڵێك؛ ئینجا هـەمووی وەك ساردەمەنییەکی لـێ دێت، ئینجا ئەم جامە لای سەری دابنێت و بخەوێت. لـە نیوە شـەودا جوبرائیـل بـە ئاسماندا تێپـەڕ بێت و ئەم جامە ببینێت، جا گەر جوبرِئیل بەم شێوەیە خەڵقکردووە ناتوانێ کـە...... لـەپڕ دەبینـی جامەکەت جوبرائیل...پاشـان چیت دەکـرد؟، یـاخود ئـەوەتا خـودای بـەرز و بـاڵا جوبرائیلی وا خەڵقکـردووە، کـە نـاتوانێ..... کەواتـە سوپاسـی خـودا بـە دەنگـی بـەرز بکـەن...ئەمەیـە

(٨) خواردنەوەیەکە لە شەکر دروستکراوە.

(٩) جۆرە گژوگیایەکە.. وەرگێڕ.

فەلسەفەی ژیانمان..گەرچی بە گاڵتەجاڕیشی بزانین، بەڵام خۆ ئەمە فەلسەفەی ژیانمانە..

ئینجا بڕواننە عەوامی ئەو میللەتەمان، چۆن قەناعەتیان کردووە و ڕەزامەندبوون، ئینجا بڕواننە ئەو پیاو چاکە دیندارانە، تا چ ئەندازەیەك قەناعەت و ڕەزامەندیان کردوون! بەو ئەندازە بە کلۆڵی و کوێرەوەرییان ڕازین، ئا ئەمە سوپاسگوزاریی کەرکردنانەیە، ڕێك پێچەوانەی «پێزانینی بەخششەکان»ـە. گەر لەسەر ئەو نەفامییە هاودەنگیان بین، ئاوا لەو «بەخششانە» خافڵ بین کە لێیان زەوتکراوە، ئەوان هەر سوپاسی خودا دووبارە دەکەنەوە، بەمەش لە بارێکی خراپ بەرەو خراپتر دەچین.!

هەردەم لە خۆت خوارتر بڕوانە! گەر ئەمە ڕاستبووایە، ئەوا هەرگیز پێشکەوتن پێویست نەبوو، گەر هەموو شتێك لەوە کورت بکەینەوە، بڕوانینە ئەفغانستان و قەناعەت بێنین، ئەفغانییەکانیش بڕواننە یەمەنییەکان و قەناعەتیان بێت، یەمەنییەکانیش بڕواننە مۆزەنبیقییەکان و بە قەناعەت بن، جا خۆ ئیتر هیچ پێویستییەك بە هیچ جووڵەك و بزووتنێك نییە، جا بۆچی خۆمان ئازار بدەین؟ ئەم جۆرە سوپاسگوزارییە فەلسەفەی پاشکەوتنە..لێرەدا پرسیارێکم هەیە؛ ئایا نوێگەران تووشی کەرکردن بە فەلسەفەی سوپاسگوزاری گێلانە بوونە؟ بەڵێ، بەڵام بە شێوەیەکی نوێ و ڕێزدارانە (موحتەرەمانە)!، ئەوانیش وەك ئەوانەی پێشوو گەمژەن، ڕازی و سوپاسگوزارن بەوەندەی هەیانە؟ بەڵام گەر بڕوانیتە ڕەزامەندییان، بەچی و بۆچی ڕازین؟ دەزانن کە هەمان سوپاسگوزاریی گەوجانەی زەبوونانەیان هەیە.!!

# بەشی پێنجەم
# شێوەکانی کەرکردن

کەرکردن دوو شێوەی هەیە: ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ. هەرچی ناڕاستەخۆیە گوزارشتە لە جووڵاندنی هۆشی مرۆڤ ڕووە و نەفامی و گەمژەیی و خافڵاندن، یاخود ڕاکێشانی جڵەو بۆ گومڕایی و لادان، بەڵام ناڕاستەوخۆیەکەی واتە سەرقاڵکردنی هۆش و هۆشبردن بە مافە لاوەکییە سادە و ناهەنووکەییەکان، تا لە داواکردن و بیرکردنەوە لە مافە مەزن و هەنووکەییە سەرەکییەکانی ژیان خافڵ بێت. بۆ نموونە، با وا دابنێین من سەرپەرشتیاری منداڵێکم و دەمەوێ بیخافڵێنم، بۆ ئەوەی کەلوپەلەکانی بدزم، بێ ئەوەی بزانێ! مەبەستم ئەوەیە ئامرازێکی کەرکردن لە هەمان جۆری کەلوپەلەکانی بۆ هەڵبژێرم، جا هەر ئامرازێك لەو پیلانە ئامادەکراوەم بیخافڵێنێ تا ویستی من بپارێزی بێ ئەوەی هەست بە مەبەستم بکات، ئەوە کەرکردنە.

سەرەنجام هۆکار و ئامرازی کەرکردنی هەر تاکێك پێوەستە بە جۆری کەسایەتی ئەو تاکە. گەر بینیت کەسێکی جوانە و بەژنێکی لەباری هەیە، ئەوا بۆ وەرزشکردن هانی دەدەم و باسی چاکییەکان و سوودەکانی وەرزشی بۆ دەکەم، ئیدی دەیخەمە دۆڵێکی خەیاڵ و هیوا و ئارەزوو وەك ناوداربوون و پێشبرکێ و یارییەکانی ئۆڵۆمپی، ئەگەریش بینیم لە جۆرێکی دیکەیە، لەو کەسانەیە گوایە ڕۆشنبیر و نوێخوازن، هانی لێکۆڵینەوە و بەردەوامبوونی دەدەم، تا بڕوانامە باڵاکان بەدەست بێنێ، ئینجا دێم باسی سوودەکانی زانستی بۆ دەکەم و...دوای زانست کەوتن پێویستە و.. کاردەکەم تا یارمەتی بدەم لە سەفەرکرن بۆ ئەمەریکا تا خوێندن تەواو بکات، مانگانە گرەنتی دابینکردنی سێ چوار هەزار تمەن بدەم؛ ئەویش وا لە ئەمەریکایە و گەر پێویستیش بکات پتریشی بۆ دەنێرم، ئەوا هەرچی بەڵێنی پێم داوە بیبەمە سەر!، بەڵام تەواوی ئەمانە هیچ نین، جگە لە قۆناخێکی دزینی سامان و میراتی کەسەکە.

ئەگەریش بۆ وەرزش یاخود لێکۆڵینەوە و خوێندن بەکەڵك نەهات، بگرە لە کەسانی سۆزدار بوو، حەزی بە گۆشەگیری و خەیاڵات بوو..ئەوا لەسەر ڕۆژووگرتن، نوێژ، نزاکردن و زیارەت هانی دەدەم، هەموو ڕەنجێکی بۆ دەدەم بۆ هەرچییەکی بیەوێ لە پێناو نەزرکردن و زیارەتکردن و بەهەشت و دوارۆژ!!. هەموو ئەمانەش تەنیا بۆ خافڵاندنییەتی، تا ئەوەی دەمەوێ لەگەڵیدا بکەم. ئا لێرەدا دەبینین دین، وەرزش، هونەر، لێزانی، زانست، چاکە و خراپە و هاوشێوەکانیان ئامرازەکانی کەرکردنن!! چونکە هۆی سەرقاڵکردن و خافڵاندنن لە مافی هەنووکەیی، کەواتە ئامرازی کەرکردن بەگوێرەی جۆری کەسەکە هەڵدەبژێردرێ کە کەرکردنی مەبەستە، پاشان کەسانی کەرێنەر بە ئارەزووی خۆیان ئەو کەسە ڕووە و حەزەکانی جڵەو دەکەن!!. دواجار دەبینین گرووپێکمان هەیە سەرقاڵی نزاکردنن، هەندێکی دیکە وەرزشکردن، تاقمێکی دی بە وەرزش سەرقاڵن، ئەوانیتر بە زانست، هەندێکی دیکەیان بە لێکۆڵینەوە و کەسانێکی دیکەش بە زوهد، هەر یەکەشیان دڵخۆشن بەوەی لایانە. ئیتر هەر شتێك «من» وەك مرۆڤ و «ئێمە» وەك کۆمەڵگە سەرقاڵ بکات و لە لێزانی مرۆیی و لێزانی کۆمەڵایەتیی بخافڵێنت ئیدیی ئەوە ئامرازێکی کەرکردنە.

## جەنگی فریودەر:

جەنگی فریودەرانە یەکێکە لە ئامرازەکانی کەرکردن و خافڵاندن لە دوو لێزانییەکەی باسکران (مرۆیی و کۆمەڵایەتی). مامم کە نیشتەجێی گوندێکی شارۆکەی "مزنیان"ـە و سەیدێکی ئەو گوندە مامەڵەیەکی پێکەنیناوی لەگەڵ کردووە، ئەڵبەت مامم زۆر حەزی بە «کەڵەشێر» دەکرد، ڕۆژێك ئەو سەیدە هاتە لای و پێی گوت:

ـ لە «بەهمەن ئاباد» نزیکی ئەو گوندەمان، کەڵەشێر زۆر هەرزان دەفرۆشن.!

+ یانی دانەی بە چەند؟.

- کەڵەشێری جوان و ساخ و نەئەمەریکی؛ دانەی بە پێنج تمەنە.!

+ نا چۆن شتی وا دەبێ؟ (مامم نکۆڵی کردووە) خۆ لێرە کەڵەشێر بە دە تمەنان دەفرۆشن؛ هەر کیلۆمەترێك لێرە دوورتر بە پێنج بفرۆشرێ؟، نا..ناکرێ ئەمە.!

- نا قوربان! بۆ نابێ، بێنە پارەم بدێ تا کەڵەشێرانت بۆ بێنم.!

+ ها بگرە..ئەمە پەنجا تمەن، دە کەڵەشێرانم بۆ بێنە.!

ئیتر سەید ڕۆیشت، دوای دوو کاتژمێران بە خۆ و دە کەڵەشێری گەورە و قەڵەو گەڕایەوە، هەر دانەی تەنیا بە پێنج تمەنان!، مامیشم پرسی:

+ خۆ پارەی دیکەت ناوێ؟.

- ناااا..قوربان، گەر پێویستتان بە کەڵەشێری پتر هەبوو، ئەوا بۆتان دێنم.!

دوو مانگ تێپەڕین، هاوڕێیەکی مامم لە "بەهمەن ئاباد"ەوە هاتە سەردانی، دادەنیشن و قسە و باس دەکەن، میوانەکە دەڵێ:

= پێویستت بە پارە نییە؟.!

+ نااا...قوربان، بەڵام گەر پێویستتان بە کەڵەشێر هەبوو، ئەوا بۆتان دێنم.!

= نا دایکی منداڵان هێلکەی لەژێر مریشکێکی کڕکەوتوو دانابۆوە تا هەڵیان بێنێت، نەزرمکرد بوو، هەر کەڵەشێرێکیان هەڵهێنا بۆ تۆ بێت.!!

دوای ماوەیەك شازدە حەڤدە جووجەڵەی هەڵهێنان، چوار..پێنجێکیان مردن، ئەوانی دیکەیش هەموو کەڵەشێر دەرچوون، دوای شەش مانگ هەموویانم بۆتان نارد، بارکە و جووجەڵەی چۆن بوون؟.

+ چی؟ بارکە و جووجەڵەی چی؟

= ئەوانەی بە سەیددا بۆم ناردن.!

+ سەید..کام سەید؟ ئێ خۆ ئەو هەر دانەی بەپێنج تمەن پێ فرۆشتم و پارەکەی خۆی وەرگرت.!

= پێنج تمەن.. ئەوە چی دەڵێی؟ نرخی کەڵەشێرێك لە (بەهمەن ئاباد) پازدە تمەنە! لێرە گرانتریشە.!

+ دەنا لە سەیدم پرسی نرخی کەڵەشێر لە (بەهمەن ئاباد) چەند؟ گوتی: هەر پێنج تمەن، بۆیە پەنجا تمەنم پێدا، ئەویش دە کەڵەشێری بۆ هێنام.!

= نا قوربان، ئەمە نەزر بوو. ئەمە چییە ئەم پەنجا تمەنە.!!

مامم دەڵێ پاشان زانیم کە سەید لە (بەهمەن ئاباد) بوو، ئەو هاوڕێیەشم داوایکردبوو کە کەی دەچێتە «مزینان» ئەو کەڵەشێرانەم لەگەڵ خۆیدا بۆ بێنێت. بەو جۆرە سەید لەگەڵی ڕێککەوتبوو، بەڵام کە هاتبووە «مزینان» پەنجا تمەنی لە من دەستکەوت و ئینجا کەڵەشێرە نەزرکراوەکانی بۆ هێنام.!!

مامم بەردەوام بوو لە باسەکە، کاتێك من و میوانەکەم لەبارەی کەڵەشێرانەوە قسانمان دەکرد، لەناکاو دەنگێکی بەرز گوتی:

- قوربان! ئەوە بۆچی دانیشتوون؟ وا لە پشتماڵتان خوێن ڕشتنە، دووان کوژراون و سێیان مردن و ئەوانیدیی لەناوچوون..ماڵی فلانەکەسیش سووتا!...

بە پەلە و شڵەژانەوە ڕامانکردە دەرێ، تا بزانین چی بووە، کەچی کەسمان نە لە دەرێ نە لەو بازاڕە نەبینی، تەنیا دوو پیاوی بێ خەم و خەیاڵ خەریکی «قەنە» کێشان بوون! لێمان پرسین: چ باسە؟ چی ڕوویداوە؟ کوا شوێنی ڕووداوەکە؟ وەڵامیان داوە: ڕووداوی چی؟ هیچ شتێك ڕووی نەداوە! کە گەڕاینەوە بینیمان سەید لەو ناوە نەمابوو! ڕایکردبوو..ئیتر بەو جەنگە فریودەرە خۆی لەو گێژاوە دەربازکرد، کە تێوەی گلابوو، نەوەك شەرمەزار بێت..

فریودان! فریودان!

وا شەڕە! قوربان وا شەڕە!! دەیەوێ مەسەلەی کەڵەشێرەکانمان لەبیربباتەوە، بۆیە دەڵێ: وا شەڕە! خوێن ڕژاوەتە سەر زەمین..دەیەوێ کێشەی کەڵەشێرەکان بشارێتەوە، تا ببێتە باسێکی لەبیرکراو، بە درۆ شەڕێکی فریودەرانەی ناوەتەوە، کێشەیەکی «لاوەکی» دەخاتەوە لەپاڵ کێشە "سەرەکی"یەکە بۆ ئەوەی تا ماوەیەکی باش هۆش و بیرانی خەڵك بخافڵێنێت...!!

هاوچەشنی ئەمەش! مەیدانخوازیی شیعری کۆن لەگەڵ شیعری نوێ، چارشێو لەگەڵ «مانتۆ»، ڕێنووسی فارسی لەگەڵ ڕێنووسی لاتینی، پاشکەوتوو لەگەڵ نوێخواز، هەموو ئەمانە جەنگی پووچەڵی فریودەرن، ڕێك وەك جەنگە کوشتار و خوێن و ئاگرەکە لە پێناو هێشتنەوەی کێشەی کەڵەشێرەکان بەداپۆشراوی.

بە درێژایی ساڵانی نێوان ١٣٢٠ و **١٣٣٠** لە ئێران هەژدە تا بیست جەنگ هەڵگیرسا، هەمووی لە پێناو ئەوەی پرسی کۆمپانیای نەوت نەگاتە بیر و زەینی خەڵك!!، لە سەدەی نۆزدەی زایینیدا کە چالاکییەکانی «داگیرکاری» (ئیستعمار) گەیشتە چڵەپۆپە، حەڤدە پێغەمبەر دەرکەوتن، ئەمەش لەماوەی کەمتر لە سێزدە ساڵان لە چینەوە تا بوشەهری ئێران. ئەمە لە کاتێکدا ڕۆڵەکانی گەلەکەمان و ئۆمەتی ئیسلام لەتاو زوڵم و فشاری داگیرکەران تامەزرۆی مردن بوون، هەزاران جووتیاری ئێران لەسەر جیاوازییەکی ئاقیدەیی کوژران داخۆ: ئایا ئیمامی مەهدی لە جیهانی مادییە یان لە جیهانی ڕۆح؟ سەیر ئەوەیە لە ساتەوەختی ئەم ململانێیە، بانگخوازێك دەرکەوت هەردوو ئەم ڕایەی ڕەتکردەوە، دەیگوت: ئیمام لە

جیهانی ئاسمانە لە نێوان لاهووت و ناسووتە[١٠]؛ لەنێوان جیهانی سەروو و جیهانی خواروو. هەزاران جووتیار لە پێناو ئەم ئاقیدەیە کوژران و هەزاران مرۆڤانی ڕەش و ڕووت دژی لایەنگرانی ئەم ئاقیدەیە شۆڕشیان گێڕا و کوژران.

لە جەنگی «جیهانی ئاسمان» لە سەدەی نۆزدەمدا دوو لایەنی شەڕکەر کێن؟ بێگومان دوو لایەنی شەڕکەر بریتیبوون لە: لادێیی و شاریی، لایەنگرانی ئاقیدەی «جیهانی ئاسمان» و نەیارانیان! لە پێناو چی؟ بۆ سەلماندن یاخود ڕەتکردنەوەی جیهانی ئاسمان! کەی؟ لەو ساتەوەختەی ئەورووپا بە جەنگی سەرمایەداریدا تێپەڕدەبوو، جەنگێکی بەرهەمدار، هاتنە ئێرەش تا ئاگری جەنگی «جیهانی ئاسمان» بەرپا بکەن. ئەم جەنگەش چییە؟ ئەمە کەرکردنە!! داخۆ چەندین جەنگی پووچ و بێ واتا لەم سەردەمە لەنێوانماندا ڕوودەدەن، دوای سەرکەوتنی لایەنێکی ململانێیەکە، ئینجا دەردەکەوێ چ هیچ و پووچییەکە!! هەرچی هوتاف و هەڵچوونانەی لایەنێك دژ بەویتر، باوك دژی کوڕی، کچ دژی دایك، کوڕیژگە دژی کیژۆڵە، نوێ دژی کۆن، نوێخواز دژی پاشکەوتوو، هیچیان هیچ نین، جگە لە زنجیرە جەنگێکی چەواشەکاری فریودەرانە! ڕێك وەکو ئەو جەنگەی لە پێناو کەڵەشێرەکان دروست بوون، لە کاتی پشکنین و لێ پێچینەوەشدا ئەنجامەکە هیچ دەرچوو، جەنگیش لە بەرژەوەندیی ئەوەیان بەکۆتاهات کە ئاگری شەڕەکەی هەڵگیرساند...جا بە لەدەستدانی هەل، بێ هیوایی و لەناوچوونی نەوەیەك و بێبەشبوون لە بەرهەمی کۆشش و هەوڵ و تەقەلای، ئیتر نەوەیەکی دیکە دێ تا بەرەنگاری جەنگێکی چەواشەکاری دی بێتەوە.

هەر ساتێك لە هەر کۆمەڵگەیەك دووبەرەکییەك ڕوودەدات، پێویستە لە گۆشەی پێوەستبوونی ئەو دووبەرەکییە بە «لێزانی مرۆیی» و «لێزانی کۆمەڵایەتی» لێی بڕوانرێ، چەندێك پرس و باسی بیری هەن، دینی و نادینی، فەلسەفی و زانستی، وا بە شێوەیەکی درۆین و ساختە و ناڕاست بەسەر هۆش و بیرکردنەوەدا سەپێنراون!! چەندێك دەمەتەقێ و مشتومڕ لەبارەی هەندێ وشەی عەرەبیی هاتووی ناو زمانی فارسی کراون! زۆر پێداگیربوون لەسەر سڕینەوەی ئەو وشە عەرەبیانە و ڕیشەکێشکردنیان لە زمانی فارسی! باشە..دەی ئەوە سڕیانەوە! پاشان چ بوو؟ هیچ، جگە جارێکی دیکە لە کێشمەکێش و مشتومڕ لەسەر سڕینەوەی وشەکان، ئینجا لە قسەکردنی دروست کەتن و و کەوتنە قسە وەك

---

(١٠) ناسووت: سرووشتی مرۆیی لە بەرامبەریدا لاهووت بە مانای خودایی.. وەرگێڕ

کەڕ و لاڵ! ئینجا دەڵێن: ئێمە تاکو ئەمڕۆ ماندووبوونی زۆرمان چێژت، هەتا زمانی پاراوی فارسیمان بونیاد نا، جا ئێستەش پێویستە پاکسازی بکەین. دەی چاك دەکەن، بەڵام پاشان؟ هەر پڕوپووچایەتی، بەڵام کێشەکە شتێکی دیکەیە!! کێشە ڕاستەقینەکە شتێکی دیکەیە، جەنگە ڕاستەقینەکەش جەنگێکی دیکەیە! بەڵام دەنگانێك بەرزدەبنەوە و دەڵێن: ئەی خەڵکینە! نەبوونی و کەساسی هەردووکیان هۆکاری نەفامین، هۆی سەرەکییش لە ڕێنووسمانە!! با ڕێنووسمان بکەینە پیتی لاتینی! خۆ تورکیا بەر لە چل ساڵ ڕێنووسی گۆڕی بۆ لاتینی، تا ئێستەش هەر پاشکەوتووە، کەچی چین و ژاپۆن بە پازدە ساڵان توانیان نەخوێندەواری بنبڕ بکەن و بێنە ڕیزی وڵاتانی پێشکەوتووی باڵا و شارستانی، لەگەڵ هێشتنەوەی ڕێنووسی کۆن لە هەردوو وڵاتدا، بگرە هەر بۆ خۆی بۆتە هونەرێك، تەنانەت ئەوانەی لە خوێندنەوە و نووسینی ئەو جۆرە ڕێنووسە لێهاتوون بە زانایانی ئەم وڵاتانە دەژمێردرێن. دەی ئێوە لە کوێوەی ئەم مرۆڤانەوەن؟ لە کوێ خەوتوون؟ خۆ ئەوەی ئێوە دەیکەن هەمووی جەنگی کەرێنەرانەن، هاوشێوەی جەنگی کەڵەشێرەکانن بۆ چەواشە و ساختەکردنی ڕاستییەکان.

# بەشی شەشەم
# پسپۆڕی

هەموو کەسێك لەسەر ڕێباز و پسپۆڕی خۆی بە ئاڕاستەیەکدا دەڕوات ، لەگەڵ ئەمەش خافڵە لە دۆزی کۆمەڵگە و چارەنووسی. ڕێك وەك مانگایەکەی "ئەفلاتۆن"، کاتێك کەسێکی چاو بەستراو یاخود کوێر دەست لە سەری دەدات و یەکێکی دیکە لە قۆچی، سێیەمیش لە کلکی؛ سەرەنجام کەسیان هەستیان بەوە نەکرد کە ئەمە ئاژەڵێکە! پسپۆڕیش وایە؛ مرۆڤ نووقمی ناو چوارچێوەیەکی سنوورداری زۆر بچووکی دابڕاو لە کۆمەڵگە دەبێ، بە شێوەیەك سەختە لە یەك کاتدا دەست لە گشت لاشەی تەواوی مانگایەکە بدات، بۆیە پسپۆڕی زۆرجار لێزانیی کۆمەڵایەتیی ناهێڵێت، وەك چۆن ئەو توانایەی تاك زەوت دەکات کە بە هۆیەوە هەست بە خۆی دەکات وەك مرۆڤێکی پشکدار لە تەواوی ڕووەکانی ژیان. هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە پسپۆڕی کار لەسەر گەشەکردنی یەك لایەنی تاك دەکات و گشت لایەنەکانی دی پەکدەخات. لێرە پرسیار ئەوەیە: ئایا پسپۆڕێتی کارێکی پێویستە؟..بەڵێ..بێگومان کارێکی پێویستە، ناکرێ بە هیچی دابنێین، بەڵام پێویستە لەو ساتەی دەبینە پسپۆڕی لقە جیاجیاکان، ئەوا پارێزگاری لە «گشتایەتیی مرۆیی» و «گشتایەتی مرۆیی»یمان بکەین.

## زانست:

هەڵوەستەکردن لەسەر ڕاستییەکانی جیهانی سرووشت و ڕووانینە ڕووخسارەکانی دنیا، لە ئەرکی ئەو زانستەیە کە درۆزنانە کارمان تێ دەکات، وەك تینووی مەعریفە لەگەڵیدا دەمێنینەوە! کەسی «زانا» وا دەزانێ کە خاوەن بێداری و هۆشیارییەکە سەبارەت بە خۆی و کۆمەڵگە و سەردەمەکەی. بەڵام ئەمە خەیاڵە، چونکە ئەو هەر تەنیا «زانا»یە و هیچی دی! زانستیش لە پێناو زانست هەر تەنیا ئامرازێکی لادان و گومڕابوونە لە

بێـداری مرۆیــی و بێــداری کــۆمەڵایەتی.. بــە ڕاســتی «هایدگــەر»ی گــەورە فەیلەسووفانی ئـەم سـەردەمەی ئێمـە و مامۆسـتای "سـارتەر" ڕاسـتی گـوت: زانسـت و شارسـتانێتی بەرهـەمی بارودۆخـە زۆر و کەڵەکـەبووەکانن، وای لێهـاتووە مـرۆڤ تێیـدا نامۆیە! واتە بۆتە قوربانی لێکۆڵینەوە و زانست و هونەر و شارستانێتی.

ئێمە کە سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبێك یاخود دۆزینەوەیەك یان داهێنانێك دەبین، ئەوا ئێمە بە خۆمان نامۆ دەبین (واتە نەبوونی بێداری دەروونی) خۆ هەست ناکەین، ئیتر دەبینە ئامرازێك بە دەستی کار و لە پێناو کار. ئیدی شارستانێتی و پیشەسازی و زانست لە کۆی ئەم دۆخانە پێکهاتوون. پێکهاتنیشیان لە دۆخی دوورکەوتنەوەی مرۆڤە لە خودی خۆی و تێڕامان لە خۆی، هەروەها لە قووڵبوونەوەی لە شتانێکی دیکە؛ لەبەرئەوەی بەو ئاوایە کاری مرۆڤ وەك ئامێرێك وایە کە بەرهەمێکی دیکەی لێوە دەرچێت، ئیتر لەم ساتەوەختانەدا پیشە و شارستانی دەرکەوتن. ئا بەم جۆرە زانست زیان بە بێداری مرۆیی و بێداریی کۆمەڵایەتیی دەگەیەنێت.

## توانای ماددیی جەستەیی:

ئەم تونایەش خۆی کارەساتێکی مەزنە، جا جەستەیی بێت یاخود هونەری یان ئابووری، بۆ نموونە کە سامانێکی زۆرم لەلا کەڵەکە دەبێ و توانای زۆرم دەبێ، ئیدی وا خەیاڵ دەبەم کە هەر تەنیا «من» خۆم دابینم کردووە، هەر «من» خۆم هەمە! ئەمەیە لادان لە ناخ و دەروون؛ چونکە مادە و سامانم لە شوێنی «خۆم» داناوە، یاخود خۆم لەو پێگەیەم داناوە کە توانایەکەم دابین کردووە، یاخود ئەو توانا مادییە بۆتە بەشێکی توانای مرۆییم. بەمەش «بێداریی کەسی»یم دۆڕاندووە،

بەڵام ڕاستی باسەکە وا نییە! ڕەنگە هەندێ خەڵك توانایەکی جەستەیی وایان هەبێ وەك توانای فیل یاخود حوشتر؛ بەڵام تەنانەت بە ئەندازەی هێزی چۆلەکەیەکیش بێداریی دەروونییان نییە! لێرەشدا توانای جەستەیی زیان بە هۆشیاری و بێداری دەگەیەنێت! گوتراوە: «ئەقڵی ساخ لە جەستەی ساخدایە» بەڵێ وایە، بەڵام جەستەی ساخ مەبەست لە جەستەی «بەهێز» و جەستەی «نارێك» نییە، هەندێکیش دەڵێن: با جەستەشت پڕ و پتەو بێت، خۆ هەر لە مانگا زلتر نابیت، با وا دابنێین، ئینجا چی دەتدۆشن! ئەگەریش هێزت پتربوو، خۆ هەر لە کەر بەهێزتر نابیت، با وا دابنێین، ئینجا

چی خۆ بارت لێ بار ناکەن!، هەروەها گەر لە ڕۆیشتن و ڕاکردن خێراییت پتربوو، خۆ هەر لە ئەسپ خێراتر نابیت، با وای دابنێین؛ ئیتر خۆ سوارت نابن! دەی ئیتر مرۆڤی «هۆشیار» لە توانایدایە کە بەهێز بێت، بەڵام تا ئەو ئەندازەیەی خۆی و هێزی کۆنترۆڵی چارەنووسی بکەن. جا ئەو مرۆڤە کێیە؟ بە دڵنیاییەوە ناپلیۆنی بەهێز نییە! کە وا گوزارشتی لە خۆی دەکرد «ئەو وەختەی لە دورگەی هلن بوو» دەیگوت: من وەك پارچە تەختەیەکی بێ هێزم کە شەپۆلەکان چۆنیان بووێت بەو ئاوایە یاریی پێ دەکەن...ڕاستە، خودا هیچ کەسانێك ناگۆڕێ تا خۆیان نەیگۆڕن، بەڵام؛ خۆ گەر مرۆڤ خۆی و سرووشتی گۆڕی، ئەوا دەتوانێ چارەنووسی خۆی و مێژووشی بگۆڕێت، دەی ئەمەش هیچ پێوەستییەکی بە جەستە و سامان و پێگە نییە، بگرە بە مرۆڤبوونی تاکەوە بەندە، هەر ئەمەشی بۆ دەمێنێتەوە...

## نوێبوونەوە یا شارستانێتیی بەکاربەرانە (الاستهلاكية):

دەشێ شارستانێتی و پێشکەوتن لە پاڵنەرەکانی کەرکردن بن..بۆ نموونە لە شانشینی سعوودیدا نموونەی زۆری ئەم پێشکەوتنە کەرێنەرنە هەن، لەوێدا بابایەکی ڕەوەندی کلۆڵ ئۆتۆمبێلی «کادیلاك» لێ دەخورێت نرخەکەی ۲۲۰۰۰ تمەنە، بەڵام لە ئەمەریکا بە ۳۰۰۰ تمەنە! ئەو ڕەوەندە دەوارنشینە ئۆتۆمبێلەکەی لە وڵاتێکدا داژوات هیچ سزایەکی سەرپێچیکردنی لێ خورینی ئۆتۆمبێل نییە، بگرە سیستەمێکی هاتوچۆی پیادە و شوفێرانیش نییە؛ چونکە بە ڕای ئەوان ئەمە پێچەوانەی شەرعە[(١١)]، گیروگرفت دەنێتەوە. لەوێ؛ پۆلیس خوترمەی ئاسنیان هەڵدەگرت و لە بنمیچی ئەو ئۆتۆمبێلانەیان دەدا کە سەرپێچیان دەکرد لەبری سزای مادی، دەی خۆ دەشزانن؛ ئەو ئۆتۆمبێلەی لە لایەك دووان لێدرانی هەبێت، زووتر پەکی دەکەوێت و شڕوشەق دەبێ، ئینجا فیتەر و شارەزایان نییە بۆ چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلان. بە کورتییەکەی، دوای ساڵێك یاخود دووان ئیدی ئۆتۆمبێلەکە کەڵك و سوودی نامێنێت، ئەمەش بە هۆی ئەو هەموو لێدان و شووختانەی بەریکەوتووە لە جیاتی ئەو سزا داراییەی پێیان وایە بێ شەرعییە!! دەی ئەنجامەکە..لە بەرژەوەندیی کێیە؟..شوفێرێکی ڕەوەندی خێڵەکی بە

---

(١١) ئەوە سەرەتای هاتنی ئۆتۆمبێلە، ئەگینا ئێستاکە سعوودیەش وەك وڵاتانی تر یاسای هاتوچۆ و سزای سەرپێچیکارانی هەیە.. وەرگێڕ

پێی شەقارەوە لەناو ئۆتۆمبێلێکی «کادیلاك» یاخود «شیفۆرلێت»، بە جۆرێك شانازی دەکات و پۆز لێ دەدات کە خودی ئەمەریکی نایوێرتێ!!، بەڵام ئەو نەفامە بێ ئاگایە لەو هەموو زیانەی داویەتی و لەوەشی کەوتۆتە تەڵەی دوژمنەکەیەوە[12]، ئەوەی بیرچۆتەوە بەر لە ساڵێك لە چۆڵەوانی و بیابان حوشتری دەلەوەڕاند، ئێستەش وا فێری لێخوڕینی ئۆتۆمبێل بووە!!. ئەم شانازیکردنە هیچ نییە، جگە لە »شارستانێتیی بەکاربەرانە»، شایەنی گوتنە: ئەم شارستانێتییە خراپتر و قێزەونترە لە دڕندەیی و کێویلکەیی! بەڵێ.. ئەوەی تەنیا لە بەکاربردندا شارستانیبووە، ئەوا لە خوارەوەی کێوی و دڕندەیە!، چونکە دڕندە ئومێدێکی پێوە ماوە لە ڕێگەی بەرهەمهێنانەوە شارستانی بکرێت، بەڵام بەکاربەری بێ بەرهەمی ئاسایی جێی ئومێد نییە، ئەو شوفێرە سعوودییە حەفت تا دە حوشتری لە بیابان هەبوو، فرۆشتوویەتی تا قیستی یەکەمی قەرزی ئەو ئۆتۆمبێلە «کادیلاك»ـە ئەمەریکییە بدات کە بۆ سواربوون کڕیوویەتی. جا تێڕابمێنن، چۆن سامانی ئەو وڵاتە هەژارە دەدۆشرێت کە تاکە سەرمایە و هەرچی هەیەتی و نییەتی هەر ئەو حوشترانەن! ئینجا ئەو ڕەوەندە ماندوو دەبێ، زەحمەت دەکێشێ، هەر تەنیا بۆ ئەوەی پاشماوەی قیستەکانی دیکەی بدات!، بەڵام کوا خۆ چیی ماوە؟ هەر پارچە ئاسنێکی ماوە، کە تەنیا چەند ڕۆژێك ئۆتۆمبێل بووە، بەڵام ئەمڕۆ پارچە پلێتێکی هەڵزڕاوە کە هەر بۆ ئەوەی سزای سەرپێچی نەدات تیغ و بڕ کراوە.

حوشترەکانی فرۆشتن و چەند ڕۆژێك لەناو «کادیلاك» دانیشت لە جیاتی ئەوەی سواری حوشتر بێت، سوار دەبێ و دادەبەزێ.. ڕادیۆ پێ دەکات، پاشان کە ویستی دایدەخات، ئینجا داوای کوشنی حەسیری دارخورما دەکات!! هەزار شێوە و ڕەنگ داوا دەکات تا ئۆتۆمبێلەکەی ببێتە مۆدێلی عەرەبی! بەڵام ئێستا؛ هەر خۆی و کەلەشە ئاسن ماوەنەتەوە و... هیچی دی!!. ئیتر کەڵکی نەما، مەگەر بچێ دەست بە دزیکردن لێرە و لەوێ بکات، یاخود سواڵکردن یاخود خزمەتکاری..یانیش لە پەنایەك چاوەڕێ بکات بمرێ و ئاسوودە سەر بنێتەوە. ئەمە سەرەنجامە بێگومانەکەیەتی، لە کوێ؟ لە

---

(١٢) ڕێك وەك بەسەرهاتی ژەنەڕاڵ « ئەکیوم»؛ سەرەتای پەیدابوونی شووشەی ڕەنگاوڕەنگ، لەگەڵ باوکی سەردانی ئەفریقیایان کرد، هەندێکیش لەو شووشانەی لەگەڵ خۆیان برد، جا لە زەماوەندەکانی ئەوێ پیشانی سەرۆکی هۆزەکانیان دەدا ئەوانیش سەریان سووڕدەما و سەرسام دەبوون! ئیتر بەرامبەر چاکترینی مێگەلە مەڕێك لەم شووشانەیان دەدانێ، ئینجا زۆریش دڵخۆشدەبوون بەم دەستکەوتانەیان و بە سەرفرازییان دەزانی (بڕوانە هیممەتی مەردایەتی و بەخشندەیی).

ولاتێك ڕووبەرەكەی دوو هێندەی ڕووبەری ئێرانە، كەچی ئەمڕۆ پێنج هەزار حوشتریشی لێ نییە، ڕۆژانێك مەڵبەندێكی كۆكردنەوەی حوشتران بوو، ژیانی گشت ئەو گەلەشی پێوە پێوەستبوو، ئەڵبەت لە پێناو دەستكەوتنی ئۆتۆمبێلی ئەمەریكی و بە هۆی ئارەزووە پاشكەوتووەكانیان وا خەریكە ئەم ژمارە كەمە حوشترەش لەناودەچێت..ئەمەش شارستانی و نوێبوونەوە؟!..داكردنی پارچە ئاسنی ئۆتۆمبێلی لەكاركەوتووی ئەمەریكی!! ئای نەگبەت و داماون، دڵخۆش و سوپاسگوزار و ستیاشكارن..دەڵێن: وا لە بەهەشتداین..ئەگەر بەر لە پێنج ساڵان بهاتیتایە ولاتمان ئەوە ئۆتۆمبێلت هەر نەدەدیت، حوشتر و ماندووبوون و شەكەتیت پێكەوە نەدەدیت، خۆ هاتوچۆ و گەڕانمان هەمووی لەسەر حوشتر بوو، بەڵام ئێستا سوپاس بۆ خودا فڕۆكەی «بۆینگ» و ئۆتۆمبێلی مۆدێل ساردی و گەرمی...! تەنانەت گەیشتۆتە ئەو ڕادەیە گەر یەكێكیان ناو ئۆتۆمبێلێكی «بیجۆ» بتبینێ ئەوا بە سووك و كەم تەماشات دەكات، چونكە لای ئەوان كەسانی سادە و ئاسایی وا «كادیلاك» و شوفرلێتی ٧١ و ٧٢ی هەیە(١٣)... چۆن؟! ئەمە پێشكەوتنەكەیانە، بێگومان پێشكەوتنێكی ڕواڵەتیانەیە.!

ئەمڕۆ هەر كە ئەوروپییەك یان ئەمەریكییەك دەچێتە ڕیاز، سەری لەو نوێكارییە سوڕدەمێنێ، سەدا سەدی ئۆتۆمبێلەكان هەموویان لە مۆدێلی ٦٩ و ٧٢ن، لە هیچ ولاتێكی جیهان نموونەیان نییە؛ لە ئەمەریكاوە تا ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست؛ سەیری هەر ولاتێكی پاشكەوتووی ئابووری دەكەی، دەبینی لە ولاتانی دی مۆدێلخوازتر و جوانكارترە!! كە فڕۆكە لە پاریسەوە دەفڕێت و دەتبا تا لە دار سەلامی پایەتەختی تەنزانیا داتبەزێنێ، ئیدی سەرت لە جوانی و شكۆ و بەرز و بڵندی نوێگەریی باڵەخانەكان و دوا مۆدێلی ئۆتۆمبێلان سوڕدەمێنێ!! ئەم هەموو جوانكارییە چییە؟ ئەمە پێشكەوتنی بەكاربەرانەیە، ئەو شتەی بە قەرز دەماندەنێ تا لە پێناویدا ئومێدی بەرهەمهێنانمان لێ زەوت بكەن..بەڵێ، تەواوی ڕۆژهەلات قوربانی ئەو بەرهەمە بەكاربەرانەیە، ئەمیش بە هۆی پاشكۆیەتی و لاسایی كوێرانە!!

(١٣) بۆ سالانی حەفتاكان ئەمانە تازە مۆدێل بوون.. وەرگێڕ

## ئازادییەکانی تاک:

ئـازادیی تـاك ئـامرازێکی بـەهێزی هۆشـبردنە بـۆ خـافڵکردنی تـاك لـە ئـازادیی کۆمەڵگـە، کـە بێـداریی کـۆمەڵایەتیش دۆزێکـە بایـەخی زۆر زۆری هەیـە. ئەوانـەی بانگەشە و بانگەوازی ئازادیی تاك دەکەن، بۆ چەواشەکردنی بیر و زەینی تاکەکانیانە، هەروەها بۆ خافڵبوونە لە «بێداریی کۆمەڵایەتی»، بە شێوەیەك مرۆڤ خۆی دەبینێ لە ڕووی کەسی و تاکگەراییەوە ئازادە لە خواردن و خواردنەوە و حەز و ئارەزووەکانی، وەك ئەو قەفەزەی باڵندەیەکی تێدایە، قەفەزەکەش لە دالآنێکی تەواو داخراودایە، ئینجا دەرگەی قەفەزەکە بکەیتەوە، ئا ئەمەیە هەستکردنێکی درۆزنانە بە ئازادی..ئەو دیلەی کە دەزانێ لە دیلێتیدایە هەوڵ دەدات خۆی ڕزگار بکات، بۆ ئەوەی لەو دیلێتییە ئازاد بێت، بەڵام ئەو دیلەی خۆی بە دیل نەزانێ و هەست بە ئازادی بکات، ئەوا ئەو هەستکردنەی درۆ و خەیاڵ پڵاویە، لەسەر ئەو ئازادییە ساختەیەش سوپاس و ستایشی خوداش دەکات.

## ئازادیی سێکسی:

ئەوە ڕۆژئاوا بە دیاری پێشکێشی ڕۆژهەڵاتی دەکات، ناوی «ئازادیی سێکسی»یە بەرامبەر ئەو کەرەستە خاوانەی قەدەخەیان دەکات و زەوتیان دەکات!، ڕۆژئاوا وا دەبینێ کە دیاری ببەخشێتە ڕۆژهەڵات لە بەرامبەریشدا چی کەرەستەی خاوی هەیە بیبات، بۆیە ڕێی داوەتە ڕۆژهەڵاتییەکان بێ هیچ کۆت و بەندێك لە «ڕووی سێکسی»یەوە ئازاد بن..دوای ئەمەش دەزگەی پڕوپاگەندە و ڕیکلام و گواستنەوە و گەیاندنی بەکۆمەڵ لە ڕۆژهەڵات دێت، بۆ ئەوەی جەخت لەسەر بانگەشەکردن بۆ «ئازادی سێکسی» بکاتەوە لەنێو نەوەی تەمەن ١٨ - ٢٠ ساڵ، لەسەر ئەم بنەمایە، ڕۆژئاوا وا دەبینێ کە لەسەری پێویستە ئەم نەوەیە بخافڵێنێت و بە «ئازادیی سێکسی» سەرقاڵی بکات، لەو باوەڕەشدایە کە ئەم نەوەیە دەرگیری دوو دۆخی پشێوی دەبێت: یەکێکان لە پێناو «ئازادیی کۆمەڵایەتی»یە، دووەمیش ئەو دۆخە پشێوی و شپرەزییەی زادەی «قەیرانی سێکسی»یە، ڕۆژئاواییەکان وا دەبینین کە زەمینەسازی و بوار فراوانکردنی «ئازادیی سێکسی» لەبەردەم ئەو نەوەیە لە هەموو شتێك ئەولاترە، بۆ ئەوەی هێندە سەرمەست و مەدهۆش بن و هیچ

هەستێك بە «ئازادیی كۆمەڵایەتی» نەكەن و بە زیادەی بزانن! بەڵێ دەتوانن پێنج شەش ساڵان خەریكی بكەن، واتە بە درێژایی ئەو ماوەیە، كە »قەیرانی سێكسی» فشار دەخاتە سەری، بۆ ئەوەی لە «ئازادیی كۆمەڵایەتی» خافڵ بێت، هەر سەرمەستی ویست و حەز و ئارەزووەكانی بێت تا ئەو ڕادەی هەست و هۆشی لەدەستدەدات، دوا بە دوای ئەم ماوەیەش مەترسییەكە لادەچێ.

## ئازادیی ئافرەت:

مەبەست لە ئازادیی ئافرەت چییە؟ دەی مەبەست هەر جەنگ و شەڕێكی دی ساختە و چەواشەكاریە! ئەڵبەت لە پێناو وروژاندن و كردنەوەی دەرگەی مشتومڕ و جیاوازیی نێوان پیاو و ئافرەت، هەروەها خەریككردنی ئافرەت و خافڵاندنی لە بنەما و دۆزە ڕەواكان و مافەكانی لە گرفتە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییەكان و گرفتی كەرێنەران و ملكەچبووان بۆ كەركردن...

## چاولێكەری و بەدواكەوتن:

لەبارەی ئەو باسە زۆر گوتراوە، بەڵام تاكە شت كە خۆی لێ نەدراوە «ڕۆڵی ئافرەت لە پرسی چاولێكەری یاخود لاساییكردنەوە». ئافرەت مەزنترین ڕەگەزە، كە ڕۆڵی سەرەكیی لە «شارستانیی بەكاربەرانە» دەبینێت، پشكی شێر و ڕۆڵی گەورەی بەركەوتووە لە بڵاوكردنەوە و پڕوپاگەندەی شارستانیی بەكاربەرانە و پەرەسەندنی جۆر و گرووپ و پێكهاتە و پێوەندییە خێزانییەكان و پێوەستییە كۆمەڵایەتی و سیاسییەكان لەم سی ساڵەی دوایی، ئەڵبەت ئەمە پێویستی بە تۆژینەوەیەكی تایبەتە، لێرە دەرفەتی ئەمە نییە، بەڵام لێرەدا نموونەیەك لەسەر پاشكۆیی و چاولێكەری دێنمەوە: نموونەكەش لە ئەورووپاوە وەردەگرین، ئەورووپییەكان دەچوونە دارستانەكان بۆ ڕاوكردنی مەیموون بە ساخی و زیندوویی. ڕاوكەرەكان قاپێكی پڕ لە كەتیرەی لەزگەیان لەژێر دار و درەختەكان یاخود كەناری ڕووبارەكان لەسەر ڕێگەی مەیموونەكان دادەنا، قاپێكی دیكەی هاوشێوەی قاپی یەكەم لە لایەكی دی دادەنا، بەڵام ئەویان ئاوی تێدابوو! ئینجا دادەنیشتن و چاوەڕێی مەیموونانیان دەكردن، ها كە مەیموون دەهاتە لای قاپە كەتیرەكە دەوەستا ڕاوكەرەكان دەستیان بەرزدەكەردەوە، مەیموونیش دەستانی بەرزدەكردنەوە، ڕاوچی دەستیان دەخستە ناو

قاپە ئاوەکە، مەیموونیش دەستیان دەخستنە ناو قاپی پڕ کەتیرەی لەزگە. ڕاوچییەکان دەستیان دەردێنا و دەیانخستە سەر نێوچاوانیان گوایە نێوچاوانیان بە ئاو تەڕ دەکەن، مەیموونەکانیش ڕێك وەك ئەوانیان دەکرد، ئینجا ڕاوچییەکان دەستیان بە ڕوو و چاویان دادێنا، هەمان شت مەیموونەکانیش دەستیان بە ڕوو و چاویان دادێنا! ئینجا ڕاوچییەکان لەبەر خۆر دەوەستان، مەیموونەکانیش لەبەر خۆر دەوەستان!! پاشان ئەو مادەیەی سەر ڕووی مەیموونەکان وشك دەبۆوە، پێڵووی چاویان پێکەوە دەنووسا و نەیان دەتوانی چاویان بکەنەوە! ئینجا ڕاوچییەکان دەچوون بە ئاسانیی دەیانگرتن!!

# پوختە

دوا ئەنجام، کەرکردنی کۆنینە - کلاسیکی- کار لەسەر سەرقاڵکردن و بێئاگاکردنی گەلان لە «بێداریی مرۆیی و بێداریی کۆمەڵایەتی» دەکات، تاکو نەوەیەکی ملکەچی پێوەر و پێودانگەکان بخەنەوە. وەك ئەوەی قورساییەکی چوار مسقاڵ و درێژیەکەی تەنیا چوار سەنتیمەرێك بێت، ڕێ و جێی نموونەیی، لە پێشەوە ڕیشێکی هەبێ و لە دواوەش عەبا و کتێبی دوعاکان، مزگەوت و نوێژ و ڕۆژووگرتن و پرسە و ماتەم! دەی ئەمە بەرنامەی ڕۆژانەیەتی تەواو و بڕایەوە.!!

ئەو نەوەیەی کەرکردنی کۆنینە پێی دەگەیەنێت، نەوەیەکی بێ ناوەڕۆك و شێواو، توانای لە ئەستۆگرتنی هیچ بەرپرسیارێتیەکی نییە! بەڵام کەرکردنی نوێ، لە پێناو زەوتکردنی «بێداریی مرۆیی و بێداریی کۆمەڵایەتی» ڕوواڵەتبازی و نمایشی سیناریۆی درۆزنانە دەکات، خۆی بە «ئەقلێنی» دەخاتە ڕوو، هەروەها بە بوونی ئۆتۆمبێلی «بیجۆ» و بەکارهێنانی دەستەسڕی «کلینکس» و «جوانکاری» و «پارەی حەواڵە» و «قەرزی بانك» و تەواو و بڕایەوە، نە بیر بکەوە و نە خۆت ماندوو بکە و نە دڵی خۆت بە هیچەوە توند بکە و خەم لە هیچ شتێك مەخۆ. هەر ئەوەندە و هیچی دی.!

بڕواننە کچەکانتان ئەوانەی شوویان کردووە و ئەوانەشی هێشتا نەیان کردووە، بڕواننە ئەو یاداشتانەی لەبارەی خۆیانەوە نووسیوویانە و چۆن چۆنی ناخی خۆیان دەردەبڕن، بە تایبەت لە پۆلەکانی پێنج و شەشی ئامادەیی..لە تەمەنی ١٨ ساڵی بەسەرەوە، چ فەلسەفییەك و ڕەشبینییەك دەبینی...خودایە بۆ دروستت کردووم، ئەی مردن بۆ لەگەڵ خۆت نامبەیت؟ ئەرێ مردن نافرۆشرێ تاکو بیکڕم!. قسەی پڕاوپڕ لە هەست و سۆزی خەیاڵاوی و دەستەواژەی ڕۆمان ئاسا، هەستی ناسك، وا دەزانی تەواوی شەو لەبەر

ئازاریی نەخۆشی هەر شەونخون بووە!، بێگومان ویستی خۆکوشتنی هەبووە، یاخود خۆی بخاتە بیر و چاڵەوە و..ئەمانە خەیاڵ و وێناکردنیانە.

بەڵام کە ئێستا دوای ئەوەی شووی کردووە، لە ماوەی دوو سێ مانگی سەرەتای هاوسەرگیری «ڕێگە نموونەیی»ـیەکەی لەدەستداوە، تۆماری یادەوەرییەکانی داوەتە کەسێکی دی تا بیخوێنێتەوە، ناچێ وەری بگرێتەوە، ڕەنگە هەر شەرم بکات سەیری ئەو یاداشتنامەی بکات، لەبەر چی؟ چونکە قەرز و قیست شەکەت و نەخۆشیان ختووە، بگرە هەر پەکیانخستووە، ئەڵبەت هیچ شتێك دەرمانی ئازارەکانی ناکات، جگە لە کارتێکی یانسیب!!، یاخود تیروپشکی بانکی (ئاوەدانکردنەوە)[١٤]، ئیدی هەر زوو بەشێکی تەمەنی ئاوا دەبێت و ئاوات و ئومێدیشی با دەیبات.!!

ئا ئەمە نەوەی «کەرکردن»ی نوێ و ئەوی دیکەش نەوەی «کەرکردنی» کۆن. ئەوەیە کەرکردن و کەراندن بەردەوام لە هەر یەکێکمان لە بۆسەدایە، خۆمان لە شێوە کۆن و کلاسیکەکەی دەردێنین، بە شێوە نوێیەکەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، لە شوێنێك لێی یاخی دەبین، بێ ئاگا لە شوێنێکی دیکە دەکەوینە داویەوە، لە لایەك ڕەتی دەکەینەوە، لە لایەکی دیکەوە گاڵتەمان پێ دەکات! هۆشیاری لایەنێکی دەبین، لایەنێکی دیکەی سەرقاڵمان دەکات، جەنگێکی فریودەرانەی ئاشکرا دەکەین، دەمانخاتە جەنگێکی دیکەی فریودەر..بەردەوام ئاوایە!!

ئیتر ئاوا، ئەم نەوەیەشمان دیلی دەستی ئەم توانایانەیە، تا ئەندازەیەك دەتوانێ هەر کاتێ و هەرچی بیەوێ بیکات و بە پێوەری تایبەتی خۆی، وەك چۆن مادەیەکی پلاستیکی قاپ و قاچاغ و کەلوپەلی جۆراوجۆری لێ دێتە بەرهەم، ئەوانە ئەهلی زانست و پیشەن، خاوەن تەلەڤیزیۆن، ڕۆژنامە، پێشانگە، شانۆ و هونەرن، لەپاڵ هەموو ئەمانەش، وەرگێڕان و زانستە سرووشتییەکان و کۆمەڵناسیشیان بەکارهێناوە، وەك ئەوەی یەکەی پێوانەی جیهانییش هەر ئەوان بن..!، ئیتر چۆن دڵنیا و ئاسوودە بین، لەوەی ئیتر نابینەوە دیلی «کەرکردنی کۆن» یاخود «کەرکردنی نوێ»؟ ها چۆن؟! ئێمە هەر منداڵی ساویلکەی خافڵێوین دڵتەنگ و پەرێشانین بە »گرێ»یەك، لە پێناو هەر شتێکی چوو ئێمەش دەچین..بە شتێکی زۆر لاوەکیی دڵخۆش دەبین..خەم و خۆشی و نموونە باڵاکانمان زۆر هیچن.!

---

(١٤) خەڵاتەکانی ڕاکێشانی تیروپشکی بانقی نیشتیمانی.

بێگومان هەر پرس و دۆزێکی تاك یاخود کۆمەڵایەتی، ئەدەبی یاخود ئەخلاقی یاخود فەلسەفی، دینی بێ یان نادینی، بخرێتە بەردەممان، لە «بێداریی مرۆیی و «بێداریی کۆمەڵایەتی»یشەوە دووربێت و لێی لابدات، با هەرچەندیش پیرۆز بێت ئیتر ئەمە کەرکردنە، جا کەرکردنی کۆن بێت یاخود نوێ.